# ڕۆشنبیریی کوردستانی

گۆڤارێکی وەرزییە بایەخ بە کاروباری ڕۆشنبیریی کوردستانیو عیراقی دەدات

ژمارە (٢)ی مانگی ئاداری ساڵی ٢٠٠٠ی زایینی

لەم ژمارەیەدا:



سەنتەری ڕۆشنبیریی میللی دەریدەکات

ROŞINBÎRÎ KURDISTANÎ
Concerning Kurdistanian & Iraqi Culture

# رۆشنبیریی کوردستانی

# KURDISTANIAN CULTURE

گۆڤارێکی وەرزییە بایەخ بە کاروباری رۆشنبیریی کوردستانیو عیراقی دەدات


خاوەن ئیمتیاز
عبدالخالق زەنگەنە

سەرنووسەر
کەمال غەمبار

بەڕێوەبەری نووسین
بلال عزیز



هەموو نووسراوێك بە ناوی سەرنووسەر بە پێی ئەم ناونیشانەی خوارەوە دەنێردرێن:

کوردستانی عیراق ــ هەولێر ــ بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پەروەردەی هەولێر

☎ ٢٣٥٧٢



نرخی (١٠) دینارە

چاپخانەی ئۆفسێتی هەولێر

# رۆشنبیریی کوردستانی

ئادار
ژماره (٣) ٢٠٠٠

## نـــــاوەرۆك

لاپەرە

# وتەی ژمارە

کە ژمارە (١)ی گۆڤاری (**رۆشنبیریی کوردستانی**)یمان دەرکرد، سەدەی بیستەم لە کەناری تەواوبوونی سوورەکەی‌و ماڵئاوایشی لە هەزارەی دووەمی ساڵی زایینی دەکرد، سەبارەت بەم ژمارەیە دوو مانگی یەکەم لە هەزارەی سێیەم بەخۆوە دەبینێت و، لە میانەی ئەم ماوە کورتەدا گۆڕانکاری نوێ‌و مەزن لە سەرجەم بوارە مەعریفییەکاندا هاتۆتەکایەوە، هەر بۆیە ئەم گۆڕانکارییانەی ئەم دواییە سەلماندییان کە جیهانگەرایی و نوێخوازی، وێرای ئەو بەرەنگاربوونەوانەی کە رووبەڕوویان دەبێتەوە رێچکەی خۆیان بەوپەڕی بەهێزی‌و خێرایی‌و بە توانایی دەگرنەبەر، چونکە ئەم دیاردەیە خەریکە ببێتە ئەمری واقیع و شتێکی حاشاهەڵنەگر، سەرەڕای ئەو هەموو شوێنەوارە ئیجابی‌و سلبییانەی کە لەگەڵ خۆیدا هەڵیگرتووە، بۆ تێپەڕاندنی ئەو چەمک و بەهاو بیرو هزرە باوانەی کە لەگەڵ خواست و خەون و ئاواتەکانی رۆشنبیران یەکانگیر نابێت. هەرچەندە ئەگەر گەلانیش بە تایبەتی لە جیهانی سێیەمدا بە وریاییەوە سەودایی لەتەکدا بکەن، ئەوا ئەم پەرەسەندن و پێشکەوتنە رۆشنبیری‌و زانستییە سەرسوڕهێنەرانە لەتوانایاندا هەیە سەرجەم ئەو ئاستەنگ و کۆسپانەی رێگرن لە بەردەمیدا رابماڵێت. کە ناهێڵێت رۆشنبیری جیهانی‌و جیهانگەرایی‌و کەلتووری مرۆیی خۆی بە هەموو ماڵێکدا بکات، ئەویش لە سایەی سەرجەم دام و دەزگە بینراوو بیستراوو خوێندراوو چەندین کەناڵ و هۆکاری جۆراو جۆر کە نوێترین داهێنراو ئەفراندنە رۆشنبیری‌و زانستی‌و هونەرییەکان بەخێراییەکی لە رادەبەدەر دەگوێزنەوە، رۆژ لە دوای رۆژیش لەسایەی ئەو کەشە دیموکراتییەی کە جیهان لە هەموو ئاستە رامیاری‌و کۆمەڵایەتی‌و هزرییەکان بە خۆیەوە دەبینێت و باڵی بەسەر کوردستانی خۆشەویستیشماندا کێشاوە.

بێگومان تەلاری رۆشنبیرییەکی رەسەن کە لەسەر بنەمای خۆشەویستی‌و رێزگرتنی بەهاو پرەنسیپ و مافەکانی داهێنان لەرووی نەتەوەیی‌و نیشتمانی

وەرۆڤایەتی بۆ سەرجەم رۆشنبیران بە تێکرایی نەتەوەو رەوتە هـزری و ئایینـەکان لـە چوارچێـوەی بڵاوبوونـەوەی ئازادییـە دیموکراتییـەکان دەبوژێتـەوەوە، بـۆ زیـاتر بەشداریکردن لە ئەفراندنی هزری و رۆشنبیری لە پێناو دارشتنی ژیانێکی نوێ، کە ئاڵابێت لە زوڵم و چەوساندنەوەو لەوتاندن و داپلۆسینی کۆمەڵایـەتی و رامیـاری، لـەم دەستپێکەوە ئەوا گۆڤاری (**رۆشنبیریی کوردستانی**) وەدەنگ خواستی رۆشنبیراندا دێت، کە بە توێژینەوەو وتارە زانستییە رەسـەنەکانیان و لـە میانـەی بڵاوکردنـەوەی بەرهەمەکانیان، گوزارشت لە گیـانی سـەردەم لـە رووی نەتـەوەیی و نیشـتمانییەوە دەکات.

پێویسـتە ئامـاژە بـەوە بکـەین کـە زۆربـەی کێشـەکانی نەتـەوەی کوردمـان تاوەکو ئێستا بەچارەسەر نەکراوەیی ماوەتەوە لەسەر ئاسـتی سـتراتیژیدا، هـەروەها دەبێ لێکۆڵینەوەو توێژینەوەکان زیاتر جەخت بکەنە سـەر ئـەو مەسـەلە بنچینەییانـەی کـە پـەیوەندیدارن بـە دۆزی گـەلی کـوردو ئاسایشـی نەتـەوەیی و جیۆپۆلۆتیکـی کوردسـتان و کـاری هاوبـەش، بـۆ ئـەوەی بتوانـین کێشـەکەمان لەسەرئاسـتی نێودەوڵەتیدا پێکەو رەهەندی راستەقینەی خۆی وەربگرێ.

ئەم ژمارەیەش لە دوو توێی خۆیدا کۆمەڵێک لێکۆڵینەوەو توێژینـەوەی جۆراوجـۆر لە خۆدەگرێت، تاوەکو بیسەلمێنێت کە شانبەشانی رەوتـی رۆشـنبیری نیشـتمانی راستەقینە گوزەر دەکات. بە تایبـەتی لـە میانـەی ئـەم توێژینەوانـە دەخوازێـت رووی سپی و پرشـنگداری راسـتییە مێژوویـی و کەلتوورییـەکانی گـەلی کوردمـان بەدەربخات، ئەم جـارەش ژمارەیـەک لـە رۆشـنبیران بەشـداری تێـدا دەکـەن و، مـافی دەربرین لەسـەر ئـەم مینبـەرە ئـازادە دەدۆزنـەوە، ئـەوا بەخشـش و وروژانـە نوێیـە هزرییەکانیان شوێنێکی مەزن دادەگرن و، ئاواتیش پاڵمان پێوەدەنێت کەوا ئـەم رووبـەرە لـە ئـایندەدا فراوانـتر ببێـت تـاوەکو بەرهـەمی ژمارەیـەکی زیـاتر لـە بەشداربووان بگرێتەوە، لەوانەی کە هەمیشە خامەکانیان بەخشش دەدات، ئێمـەش بەوانەوە پشت ئەستوورین و،هەر بە هاوکـاری ئـەوان دەتوانـین درێـژە بـەو کاروانـە بدەین.

**دەستەی نووسەران**

# گەشتێك بەنێو واتای کاری"سووتان"دا

□ د. شێرکۆ بابان
پرۆفیسۆری یاریدەدەر

## دەسپێك:

لە زمانەکەی ئێمەدا ژمارەی کارەکان زۆر کەمە بە بەراورد لەگەڵ زمانانی دیکەدا. بۆ نموونە ئەگەر لە زمانێك دا وەك زمانی فەرەنسی دوازدە هەزار کاری بنجی تۆمارکرابێت، لە زمانەکەی ئێمەدا ژمارەکە زۆر زۆر کەمترە[1]. لەگەڵ ئەوەش دا کەمی ژمارەی کارەکان[2] لە زمانێك دا واتای ئەوە نابەخشێت کە ئەو زمانە سست بێت لە راستی دا جۆرە زمانی ئاوها پڕ دەبێت لە(میکانیزم) و لە(دیاردە)ی تایبەتی بۆ پڕکردنەوەی ناتەواویەکەی. کەواتە بەپێچەوانەوە ئەو زمانە زۆر پتەو دەبێت بە رێزمان، چونکە کارەکانی دەخاتە بەر(روخسار گۆڕین)و (واتا گۆڕین)و جێی هەموو بیردۆزەکانی زمان دەکاتەوە. بۆ نموونە ئەگەر لە زمانێك دا ژمارەی کارە بنجیەکان بە شەش هەزار دانەو لە زمانێکی دیکەدا بە هەزار دانە لێك بدرێتەوە ئەوا زمانی دووەم دەبێت ژمارەی واتاکانی یەکسان بکات.

واتە ئەگەر لە زمانی یەکەمدا شەش هەزار واتا هەبێت دەبێت زمانی دووەم فریای خۆی بکەوێت و لەهەر کارێکدا شەش واتا دابین بکات[3].

سەبارەت بە سەردێری ئەم نووسینە ئێمە روودەکەین لە کاری(سووتان)و هەندێك لە رێچکەو لە سەرگوزشتەکەی دەخەینە بەر لێکۆڵینەوە. بێگومان رێچکەی واتا سازیانە لە ئەم کارەدا زۆر پێچاوپێچەو زۆر نهێنی هەیە تێیدا ئێمە لە ئەو بارەداین کە ئەم نموونەیە دەتوانێت رێخۆش بکات بۆ لێکدانەوەی چەندین نموونەی دیکە لە زمانە بێخزمەتە فەرامۆشکراوەکەدا[4].

## واتای بنجی:

کاری(سووتان) چەند ئاکارێکی واتایی هەڵدەگرێت لەواتا بنجیەکەی‌دا وەك:

- هەبوونی بکەرێکی سست کە رووداوی کارەکە لەسەری بگەرێت بێگومان ئەو بکەرە سستە بریتیە لە مادەیەکی رەق وەك(پوش، دار...هتد).
- هەبوونی ئۆکسجین لە ئارادا.
- بەخشینی وزەی کەڵکدار وەك گەرمی رووناکی لە رووداوەکەیدا.
- بەخشینی پاشەرۆکی بێکەڵك وەك(سووتوو، خۆڵەمێش، دووکەڵ).

• گۆڕینی دۆخی ماده سووتاوەکە لەباری سەخت و ڕەق و پڕ چالاکیەوە بۆ باری وردو ناسك و بێ چالاکی.

واتای بنجی لە کاری(سووتاندا) جێی هەموو ئەو ئاکارانە دەکاتەوە، بۆ نموونە لە هەموو ڕووداوێکی(سووتاندا) گازی(ئۆکسجین) پێویستەو بەبێ ئەو ڕوودانەکە ناچەسپێت. یان لەهەموو جارێك گەرمی بەخشین و ڕووناکی بەخشین هەیە. بەرانبەر بە ئەوە پاشەڕۆکێکی بێکەڵك هەیە وەك دووکەڵ و خۆڵەمێش.

لەراستیدا لێکدانەوەی واتای بنجی کاری(سووتان) زۆر ئاسانە، بەڵام لێکدانەوەی واتا نابنجیەکانی زۆر گرانترو دژوارترە.

## واتای پەرەسەندوو:

لەگەڵ ڕۆژگاردا واتای کاری (سووتان) پەرەی سەندووەو شانبەشانی شارستانیەت جەنگاوە بۆ نموونە مادەی سووتانەکە، واتا سووتەمەنیەکە گۆڕاوە لە پوش و دارەوە بۆ خەڵووزو خەڵووزی بەردین و بۆ نەوت و دارشتەکانی‌و لەپاشتردا بووە بە وزەی کارەبا. ئەوە لەیاد نەکەین، کە سووتەمەنی لەچەشنی(پووش، دار، خەڵووز، نەوت) وزەکە لەخۆیاندایە بەڵام(کارەبا) خۆی وزەیەو کە دەسووتێت نە پێویستی بە ئۆکسجین و نە پاشەڕۆکی هەیە. پاشان لە ڕووی پەرەسەندنەوە، کەڵك وەرگیراوە لەدوو سیمای سەرەکی لە ڕوودانی کاری سووتاندا وەك:

<u>یەکەم:</u> سیمای دروست و کەڵکداری ڕووداوی(سووتان) وەك گەرمی بەخشین و ڕووناکی بەخشین.

<u>دووەم:</u> سیمای نادروست و بێکەڵکی ڕووداوی(سووتان) وەك دووکەڵی ڕەش و بوون بە سووتوو و بە خۆڵەمێش.

بۆ نموونە لە ڕستەیەك وەك(چراکە دەسووتێت) واتای ڕووناکی بەخشین و سیمای کەڵکداری زۆر زاڵترە لە ئەوەی کە بگوترێت (چراکە ئاگری تێ بەربووەو وا دەسووتێت). ئەمجار لە ڕووی پەرەسەندنەوە، دەبینین کە ڕووداوی (سووتان) لە پووش و دارەوە گەیشتووە بە سووتەمەنی(نەوت) کە لەجۆرێکی‌دیکەیەو ڕەق نییەو شلە.

پاشان ڕووداوی(سووتان) گەیشتووە بە پلیتەی چراکەو پاشان گوێزراوەتەوە بۆ چراکە خۆی لە ڕاستی لە نموونەی ئاوهادا دەبا لە بنجەوە بگوترابا(نەوتی نێو پلیتەی چراکە) دەسووتێت پاشان وشەی(نەوت)، کە خۆی ڕووداوگێڕە لەگەڵ وشەی(پلیتە)دا لابراوە. ئەگەرنا چراکە ئەگەر نەوتی تێنەبێت ناسووتێت و پلیتەکەش بریتی نییە لە سووتەمەنی. بەهەر حاڵ، لە ئەم نموونەیەدا هەرچەند گۆڕان هەبێت بەڵام دووکەڵ و ڕووناکی هەیەو ئۆکسجین پێویستە.

**نموونەیەکی سەیر:**

لە نموونەیەکدا وەك:

***گلۆپەکە ئەسووتێت***

زۆر لە ئاکارە بنجیەکانی کاری(سووتان)فڕێ دروان وەك:

- نەبوونی بکەرێکی بەرجەستە کە رووداوی کارەکە لەسەری بگەڕێت.
- نەبوونی ئۆکسجین لە رووداوەکەدا.
- نەبوونی پاشەرۆکی بێکەڵك وەك دووکەڵ و سووتوو.
- نەگۆڕینی دۆخی مادەیەك لە کردەوەکەدا.

لەبەرامبەردا، تەنها ئاکاری (بەخشینی رووناکی)و (بەخشینی گەرمی) لەئارادا هەیە. کەواتە، واتای بنجیو فراوانی(سووتان) تەسك کراوەتەوە بەسەر(رووناکیو گەرمی بەخشین)دا. بێگومان لەئەم کردەوەیەدا تەنها وزەی کارەبا بەشێوەیەکی دەرەکی بار دەکرێت لەماوەیەك تا سووربێتەوەو رووناکی ببەخشێت.

لەگەڵ هەموو ئەوەشدا ئەگەر بەچاوی سەرنج بڕوانین لەهەمان نموونە بەلاّم لە دەمکاتی رابردوودا وەك:

***گلۆپەکە سووتا***

***گلۆپەکە سووتابوو***

***گلۆپەکە سووتاوە***

دەبینین کە بە زەبری گۆڕینی دەمکاتی رستەکە لە رانەبردوو بۆ رابردوو، ئاکاری بەکەڵکی(رووناکی بەخشین) دەگۆڕێت بە ئاکاری بێ کەڵکی(بوون بە سووتوو).

بێگومان، لەم ئاستەدا، دیاردەیەکی سەیر دەهێتە کایەوە چونکە دەمکاتی کار واتا دەگۆڕێت ئەگەرنا، هەموو کەسێك دەزانێت کە لەنموونە رانەبردووەکەدا(گلۆپەکە دەسووتێت) ئاکاری بەکەڵکی(رووناکی بەخشین) زاڵەو لە نموونە رابردووەکەدا(گلۆپەکە سووتا) ئاکاری بێکەڵکی(بوون بەسووتوو) زاڵە. پاشان لە ئەمە سەیرتر ئەوەیە کە لەرابردووی بەردەوامدا وەك:

***(گلۆپەکە ئەسووتا)*** جارێکیدیکە ئاکاری(رووناکی بەخشین) زاڵە کەواتە، دەتوانین بڵێین کە رەگەزی بەردەوامی(دە)ئاکاری (رووناکی بەخشین) زاڵ دەکات لەراستیدا دیاردەیەکی سەیرە کە (دەمکات) یان (دە)ی بەردەوامی بتوانێت واتا کارێکی زمانەکە بکات بە پێچەوانە یان بە(دژ واتا).

سەبارەت بە نموونەی دیکە، دەتوانین رووبکەین لە چەند چشتێك کە ئەو دوو ئاکارە هەڵدەگرن وەك:

- سووتانی فلیم کە واتایەکی تازەیەو تازە پەیدا بووەو واتای(بوون بەسووتوو) دەگەیەنێت. واتە کەڵکی نامێنێت بۆ نموونە ئیدیۆمێك پەیدابووە بۆ ئەم بەکارهێنانە وەك[٥]:

*فلیمی سووتاوە: (واتە کەڵکی نەماوە)*

- سووتانی دەرمان، کە دەڵێن ئەم دەرمانە یان ئەم مادە کیمیاویە سووتاوە، واتای ئەوە دەچەسپێت کە ئێکسپایەر بووەو وەختی بەسەر چووە.
- سووتانی سەڵاو، کە دەڵێن(سەڵاوەکەمان سووتا) واتە وەڵام نەدرایەوەو کەڵکی نەبوو.
- سووتانی بەڵگەنامە کە دەڵێن(ئەم چەکە سووتاوە)، واتە ماوەکەی تێپەڕبووەو کەڵکی نەماوەو بووە بە چشتێکی بێکەڵك.

## واتای سەرگوزشتەیی[٦]:

لە ئەم جۆرە واتایەدا زۆر لەکارەکان بەکاردەهێنرێن، بەتایبەتی کاری(سووتان) وەك:

- جەرگ سووتان، جەرگ سووتاو.

لەئەم دەستەواژەیە وشەی(جەرگ) بەرانبەر بە(منداڵ) دەوەستێت وەك(جەرگ سووتاو: منداڵ سووتاو) ئەم واتایە لەسەرگوزشتەی کەسانێکەوە پەیدابووە کە منداڵیان سووتابێت لە ڕووداوێکدا، بێگومان ئەمە ناخۆشترین کۆستەو هەر لەبەر ئەوە بووە دەستەواژەیەکی خوازراو بۆ ئەو کەسانەی کە منداڵیان دەمرێت.

- زمان سووتان، وەك:

*زمانم سووتاو پێم گوت کە ئەو نەهاتووە*

ئەم دەستەواژەیە خوازراوە لەسەرگوزشتەیەکەوە کە یەکێك لەسەرەتای دانیشتندا لەسەر خوان بەتیکەیەکی گەرم زمانی سووتابێت و کە ئیدیکە ناتوانێت بەردەوام بێت لە خواردندا. واتە کە قسەیەکی خراپی کرد، وەك ئەوە وایە کە لەسەرەتادا زمانی سووتابێت بەچشتێك.

- *سك سووتان، سك سووتاو:*

ئەم واتایە تەریبە بەواتای (جەرگ سووتاو) بەڵام بۆ دایك بەکاردەهێنرێت چونکە ئافرەت هەر سکێك بەمنداڵێك دەژمێرێت واتە، کاتێك کە گوترا(سك سووتاو) وەك ئەوە وایە بڵێین(منداڵ سووتاو) کەواتە کاتێك کە بەدایکێك دەگوترێت(جەرگت نەسووتێت) یان(سکت نەسووتێت) بە واتای ئەوە هاتووە کە بڵێیت(منداڵت نەمرێت) بەئەم چەشنە دەبینین هەموو کاتێك لە پشتی ڕووداوی سووتانەوە سەرگوزشتەیەکی توندو بەهێز هەیە ئەو چیرۆکەش شایستەی ئەوە بووە کە ببێت بەئیدیۆم و بچێتە نێو ئەلبوومی زمانەکەوە.

## بەرەنجام و گفت و گۆ:

کاری (سووتان)، لەڕووی واتا سازییەوە، بریتیە لە نموونەیەکی بەپێزو دەشێت چەندین بەکارهێنانی دیکەی هەبێت لەزمانەکەدا. لە ئاستی ئەم کارەدا، دەبێت گەشتێکی فراوان

بکەین بەواتاسازی‌دا. لەگەڵ ئەوەدا، لەئەم گەشتە بچووك وبەرتەسکەدا چەند خاڵێك هەیە بۆ تۆمارکردن وەك:

- واتـای بنجـی کـاری(سـووتان) چـەند ئاکـارێکی واتاسـازیانە هـەڵدەگرێت و لەهـەر بەکارهێنانێکی بنجیدا دەبێت ئەو ئاکارە هەبن.
- لەواتای بنجی بترازێت هەموو واتایەکی دیکە بریتی‌یە لە خوازراو و نابنجی لەهەموو ئەو واتا خوازراوانەدا رووداوە فیزیاوی‌یەکە دەبێت بە رووداوێکی واتایی.
- لەهـەندێك واتـای خـوازراوی کـاری (سـووتان)دا، سـیمای(روونـاکی بەخشـین وگـەرمی بەخشین)و (کەڵکداری) دەگوێزرێتەوە.
- بەرانبەر بە خاڵی پێشوو، لە هەندێك واتای دیکەدا واتای (بەسووتوو بوون)و (بێکەڵکی) دەبەخشێت.
- لەهـەندێك باردا دەمکـاتی رسـتەکە واتـای خـوازراوی (سـووتان) دەگۆڕێـت. بـۆ نموونـە دەمکاتی رانەبردوو و رابردووی بەردەوام، واتـای (روونـاکی بەخشـین) زاڵ دەکات. یان دەمکاتی رابردوو واتای (بێکەڵکی‌و بە سووتوو بوون) زاڵ دەکات.
- واتای کاری (سووتان) هەر لەپەرەسەندن دایە بۆ نموونـەی ئیدیۆمـی (فلیمـی سـووتاوە) رەنگە تازەترین واتای کاری (سووتان) بێت. بێگومان لەئەم سەدەیەدا فلیمی فۆتۆگراف گەیشـتووە بـە ههڵبـەندی کـوردەواری. پاشـان مـردن و بێکـەڵك بوونـی فیلمەکـە، کـە ناگەرێتـەوە بۆسـەر بـاری پێشـووی بـە(سـووتان) شـوبهێنراوە، هەرچـەند (سـووتان) لەئارادا. واتە، مردنی فلیمەکە وەك ئەوە وایە کە پووشێك یان پەڕەیەك بسووتێت و دۆخ بگۆڕێت بۆ سووتووی بێکەڵك.
- لەواتای ئیدیۆمـی کـاری (سـووتان)دا هـەموو جـارێك سەرگوزشـتەیەك هەیـە لەپشـت پەردەوەو، ئەو سەرگوزشتەیەش بەجۆرێك رووی داوە کە شایسـتەی ئـەوە بێـت کە لـە ئەلبوومی زمانەکەدا بپارێزرێت وەك واتایەك، بێگومان ئەو جۆرە واتایە کاتی خواستنی جوداوازیان هەیە. لەئەم رووەوە دەشێت کە چەند واتای دیکـە چاوەڕوانی سەرگوزشتە بن بۆ ئەوەی لەداهاتوودا لەدایك بین.

لەکۆتاییدا، ئەمە لاپەڕەیەك بوو لە ئەلبوومی واتا سازی لەکاری(سووتان)دا. بەهیواین کە ئەمە سەرەتایەك بێت بۆ هەمووان بۆ بایەخ دان بەئـەم جۆرە واتایانـە. ئـەوەش لـەیاد نەکـەین کە زمانەکەمان زۆر زۆر بێ خزمەتە لە رووی واتا سازیەوە[٧].

**پەراوێز:**

(١) لەبەرانبەردا لە زمانی ئینگلیزی دا بە شەش هەزار کار ئامار کراوە، کەچی ئەم زمانـە لـە زمانی فەرەنسی بەربڵاوترەو هەموو دنیای گرتۆتەوە (سەرچاوەی ٧، ٨).

(٢) مەبەست لەوشەی(کار) بریتی‌یە لە روخساری بنجی کار.

(٣) واتە، بە بەراورد لەگەڵ زمانی یەکەمدا، دەبێت زمانی دووەم پێنج هەزار کاری ناپنجی پەیدا بکات، تا بەرانبەر بە ئەو شەش هەزار واتایەی زمانی یەکەم فریا بکەوێت.

(٤) لەراستیدا، واتاسازی بریتی‌یە لە بابەتێکی زۆر سەخت و دژوارو بێ خزمەت لەزمانەکەی ئێمەش دا هەر ئاوهایەو زۆر گرانترە. واتە، ئەم نووسینە بریتی‌یە لەدەسپێک بۆ گەمەیەکی زۆر زۆر گەورەو ئاڵۆز.

(٥) بێگومان ئەم واتا خوازراوە زۆر نوێیەو لە پاش ژیانی داهێنان و بڵاوکردنەوەی فلیمی فۆتۆگرافی پەیدابووە.

(٦) لەئەم جۆرە واتایەدا، هەموو جارێك(زل کردنەوە: المبالغە) هەیە واتە سەرگوزشتەی رووداوێکی سەخت کراوە بە ستاندارد بۆ رووداوی واتایەکی تازە.

(٧) ئەمە کۆتایی رێگاکە نی‌یەو چەند کتێبێك ئامادەکراوە لەسەر واتاسازی‌و فەرهەنگی واتای کار.

## سەرچاوە:


١- د. شێرکۆ بابان، چەند نووسینێکی بڵاو نەکراوە لەبواری واتاسازی دا.

٢- د. فەتاح مامە عەلی، ئیدیەم لە زمانی کوردی دا، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ١٩٩٨.

٣- د. طالب حسین علی، هەندێك لایەن لەپەیوەندی نێوان رستەو واتا لە کوردی دا، نامەی دکتۆرا زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ١٩٩٨.

٤- عبدالله عزیز محمد، گۆڕانی واتای وشە لە کوردی دا، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ١٩٨٩.

٥- احمد مختار عمر، علم الدلالة، مکتبة دار العروبة ١٩٨٢.

٦- ف. ر. پالمر، علم الدلاله، ترجمة مجید الماشطة، جامعة المستنصریة، بغداد ١٩٨٥.

*7- Le nouveau Bescherelle,1, Iart de Conjuguer, dictionnaire de 12000 Verb, HATIER,Paris 1980.*

*8- Quenelle & D. Hourquin, 6000 Verbs anglais, Collection, Bescherelle, HATIER, Paris 1995.*

# جیهانبینی مرۆڤی تراژیك
# سۆفیگەریّتی وەك نموونە

□ کەریم دەشتی

(١)

کارکردن لە نێو بونیادی رۆشنبیری، کارکردنێکی ئارکیۆلۆژییە لە نێو بونیادی هزرو زەین و تێرامان، کە هەر ئەو سێ چەمکە لە نێو قولآیی دیوارەکانی سەردا دەژین و پێکهاتەیەکی مەتریالییان نییە، هەرگیز ناخرێنە ژێر کۆنترۆڵی ئیرادەوە. بۆیە کارکردن لە نێو بونیادی رۆشنبیری هەمیشە کارێکی ئەستەم و دژوارەو پێویستی بە کۆمەڵێك راستی هەیە کە دەبێ مرۆڤ بەر لەوەی دەروازەی باسێك بکاتەوە پەییان پێببات.

(٢)

لە بەرایی هەمووواندا خوێندنەوەیەکی قووڵ و برشتئامێزو دیقەتداری هەبێ بۆ سەرجەم بابەتەکانی داهێنان و کەرەستەکانی گواستنەوەی چەمکەکان بۆ ناو هزرو زەین و تێرامان، خوێندنەوە پرۆسەیەکی زانیاری بناغەیی رۆشنبیرییەو دەستووری دژواری خۆی هەیە، خوێندنەوە وەك ئەوەی من باسی لێدەکەم بریتی نییە لە کردنەوەی کتێب و بەس، بەڵکو بریتییە لە وەرگرتن و گەمەی واتاکان، پەی بردن بە هەزمکردنی چەمکەکان، ئاشکراکردن، بێ ئەو هاوکێشەیە خوێندنەوە دەبێتە رەوتی ناو پۆلە سەرەتاییەکان، لەم رووەوە سەیری خوێندنەوەکانی ئەدۆنیس بۆ کەلتووری ئەدەبیو شیعری عەرەب لە (الپابت والمتحول) وخوێندنەوەی (ئیدوارد سەعید) بۆ کاری رۆژهەلآتناسیو خوێندنەوەی (صادق جلال العظم) بۆ کەلتووری ئاینیو خوێندنەوەی (ت. س. الیوت) بۆ رەخنەی میتافیزیکیو دەیان نموونەی دیکە.

(٣)

هەڵبەت بێ ئەو خوێندنەوە سەراپاگیرە ناتوانین تێگەیشتنمان هەبێ بۆ هیچ کارێکی داهێنان و زانیارییەکی تایبەتی کە بریتییە لە دروستکردنەوەی دنیاو هەڵوەشاندنەوەی بنەما سەلەفییەکانی لێکدانەوە، کە مەبەستم بەربەستەکانی هزرو زانیاریە وەك مۆرانە لەناو ئەقڵی داهێناندا کاردەکەن، تێگەیشتنەکان بەو مانایەی کە من باسی دەکەم بریتییە لە گەیشتن و لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی رستەو واتاکانی ئەو دیوی رستەو ئەنجامگیریو بەرهەمهێنان و رامانگیری بۆ نموونە بگەرێوە سەر تێگەیشتنی (مارتن هایدگر) بۆ (نیچە)، لە گەرانەوەی ئەبەدی بۆ خود، تێگەیشتنی سوریالیزمییەکان لە ماهییەتی شیعرو نزیکەوتنەوە لە خەونی سۆفیستەکان و گەلێ نموونەی دیکە.

(٤)

دوای هەر خوێندنەوەیەك و دروستبوونی پرۆسیسی تێگەیشتن كۆمەڵێك چەمك و دژە چەمك وبیروبۆچوون دێتەكایەوە كە دەبنە بونیادی جوڵەی ئەو كەسەی لە ناو فەزای یاخود پانتایی رۆشنبیری كاردەكات، دوای بەهێزكردن و مشتومالْكردنیان رەوتێك لە بیركردنەوە لە لایدا دروست دەبێ و بە پێی سەرهەڵگەڕانی زەمەن و زێدەبوونی ئەزموون، هەمان ئەو رەوتە لە بیركردنەوە پەرەدەسێنێ و مرۆڤ دەكاتە خاوەنی جۆرێك بینینی جیاوازو لە كۆتایشدا دروستبوونی جیهانبینییەك بۆ ئەو مرۆڤە كە خۆی لە هەموو بوارەكاندا دەبینێتەوە، ئەو بوارە زانستییانەی كە ئەستەمە بۆ كەسانێك بتوانن لەناو كایەكانی كاربكەن ئەگەر سەرجەمی پرۆسیسی خوێندنەوە تێگەشتن و جیهانبینییان مسۆگەر نەكردبێت، بۆ نموونە جیهانبینی (**تاویەت لە چین**) وجیهانبینی زەردەشتییەت و بوزییەت و سەرجەم جیهانبینی سۆفیستەكانی وەك حەللاج و سەهرە وەردیو محیی الدینی عەرەبیو بایەزیدی بۆستانیو وجودییەكانی وەك سۆرین كیرك گاردو كامۆو سارتەر من لێرەدا بە كورتی باس لە جیهانبینی سۆفیستەكان دەكەم كە هەر هەموو ئەوانە لە ناو ئەلقەیەكی كارەساتبارو دژواردا رەوتی بیركردنەوەی خۆیان پەرەپێداوەو بوون بە مرۆڤی تراژیك، كە خەسڵەتی دیاری مرۆڤی رۆشنبیرە.

(٥)

هەموو منێكی رۆشنبیر لە بنەڕەتدا مرۆڤێكی تراژیكە یاخود منێكی كارەساتبارە، جیایە لە دەوروبەر جۆرێ بیركردنەوەی وەكو بیركردنەوەی دەوروبەر نییە شتەكان بە شێوەیەكی دیكە دەبینێ، هەندێ جار دەبێتە مایەی پێكەنینی ئەوانی دیكە كە وەك ئەو شتەكان نابینن، هەر بۆیەش هەموو منێكی رۆشنبیر مرۆڤێكی تراژیكە واتە دیدگای ئەو منە دیدگەیەكە لە پانتایی قودرەتی دروستكردنی وێنەیەكە یاخود وێنەكردنی بویەرێكە!! بۆ خۆی ئەوپەڕی ئازادو مەشەقەتهێنە بەلاْم بۆ وەرگر ئیستاتیكاو لەزەتە، بۆ نموونە دیقەت بكە لە كوشتنی كریستۆفەر مارلۆ وەك هونەرنووسێكی گەورەی شانۆ، یا سەیری مرۆڤێكی تراژیكی وەك (**سەهرە وەردیو حەللاج**) بكە لە كارەساتی كوشتنیاندا ئاواش لە گەڵ بواری دیكە هەر بۆیەش و لە سۆنگەی بوونێكی تراژیدی مرۆڤدا (**نیچە**) رادەكات و دەڵێت:

(تۆ نیشتمانمی ئەی گۆشەگیری، ماوەیەكی دوورودرێژ بوو لە زێدی كێوییەكاندا غەریب بووم ها ئەوە من دەگەڕێمەوە لای تۆ ئەی نیشتمان، چاوانیشم فرمێسك هەڵدەڕێژن).

یاخود كاتێك ئەمریكییەكان زەوی سووربێستەكانیان خستە ژێر دەستی خۆیان و ریْ و رەچەڵەكیان براندنەوە سەرۆك هۆزەكەیان بۆ فرانكلینی بێرسی سەرۆكی ئەمریكای نووسیبوو: (**ئەو ئاوەی هەڵدەكشێتە گیانی درەختەكان یادگاری سووربێستەكانە، كەڵەكێویوئەسپ و بازە گەورەكان برای ئێمەن، گوڵە بۆندارەكان خوشكی ئێمەن**).

یاخود كاتێك خەیامی گەورە سۆفیستی شەلاْڵ بە عیشق و عارفانە دەڵێت:

ئـەی موفتـی شـــار ئێمـــە لـــە تـــۆ پـــڕ کـــارترین
لەگـەڵ ئـەو هـەموو مەستییە لـە تـۆ هۆشـــیارترین
تـۆ خوێنـی خـەڵکان دەخـــۆی، ئێمـــە خوێنـــی ڕەزان
ویژدانـــــت بـــێ کامـــەمان خوێنخوارتریـــــــن

(٦)

بۆ دابەزینە نێو باسێکی وەك جیهانبینی سۆفیستەکان، دەبێ جیاوازی بکەین لەمیانی پرۆکەی ڕۆحانیەت و ڕەوشتی ڕۆحانیەت، چونکە یەکەمیان لەپاشینەیەکی زەینی غەیبانیەتەوە هەڵدەقوڵێ‌و دژی فیزیك دەوەستێت ڕەتکردنەوەی هۆبەندی دەکاو هەموو شتێك دەداتە دەست قەزاو قەدەرەوە، بەلاّم ڕەوشتی ڕوحانی ڕەوشتی سۆفیستەکانە کە خودانی بەهای ڕێك و ئایدیای بەرزو وێڵیە بەدوای زانیاری‌و، هەربۆیەش سوفی گەریەتی ئەگەر لەنێو فینۆمینۆلۆژیای ئاینگەراییدا دەربکێشین و وەك ستایل و ژانرێکی شیعریەت مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، ئەوا لایەنی ئیستاتیکی زۆر پڕ بەهای لێدێتە کایەوەو جیهانبینینێکی فرە پڕ تێرامان و کرێشمە سازی تیادا بەدی دەکەین، خۆئەگەر بەرهەمە فەلسەفی‌و ئەدەبی‌و زانیاریەکانی( **بایەزیدی‌و بوستامی‌و مەحوی‌و محیدینـی عـەرەبی‌و نیفـەری‌و حـەللاج و سەهرەوەردی‌و** یاخود( **رابیعـەی عـەدەوی**) بخەینە بەر دیدو لێکۆڵینەوە ئەوسا بۆمان بەدیاردەکەوێت کەشیعریەتی دەق چۆن دەتوانێ گۆڕان لەنێو زەینی وەرگر یان خوێنەر دەخوڵقێنێ .

سۆفیگەریـەتی لـەتوخوبێکی ناسـکی خۆیدا لەگـەڵ ئاسـۆی ئەگزیستانسیالیزمدا وێـك دەکـەون و لەناوی یەکتری دەخۆنەوە، هەمان ئەودوو پێڕەوە لەیەك شتدا یـەکتری دەگرنـەوە، ئەویش وەلادانـی هەموو خواست و مەرامێکە لەپێناوی ساغ کردنەوەی ڕاستیەك کەئەویش گەڕانـە بـەدوای ڕەهـایی، کەسۆفیستەکان نایانەوێ لەدەرەوەی ئەو ڕەهاییە بژین بەڵکو گەرەکیانە لەنێو کرۆکی ئەو ڕەهاییەدا بتوێنەوەو ئاوێتەیەکی خواوەندی وەدەسبهێنن و لـەنێو نورانیـەتی خـوادا بتوێنـەوە، سـەرزەمین والاّ کەن و هـەموو بـەرەو ئـەو ئاسمانـە بچـن کـەپێیان وایـە هـەموو خواسـت و ئـاوات و مـەرامێك لـەوێدا بەرجەستەدەبێ‌و وێنەکان شێوە دەگرنەخۆ.

(٧)

(**بایەزیدی بوستامی**)[1] کاتێك لە خەڵوەتی خۆیدا مەستیبوون لەناو کرێشمەی ئەو فەزایەدا ئاگاهی لێدەخواردو چەندین سەعات و سەعاتی دەخایاند وەك چۆن دەیانگوت لە حاڵـەتی فڕیندایە لەگـەڵ (**ئیزەدی منان**)دا یەکتریان دەگرتەوە، کە پێیانگوت گوایە تۆ لەسەر ئاو دەڕۆیت و لە هەوادا دەفڕیت، بۆ کاتی نوێژ دەگەی بە مەککەو دەگەڕێیتەوە وەلاّم دەداتەوە کە باوەڕداری ڕەسەن ئەوەیە کە مەککە لـە دەوری ئـەو بسوڕێ‌و بگەڕێتـەوە، بۆیـە گومـان دەبێتـە بەشـێك لـەو حەقیقەتـەی کـە لـە ئەزەلـەوە سەرچاوەکەی ڕەهاییە، نوورێکە هەمیشە لە هەڵچووندایە، هەندێ جار شێوازی مـەلێك دەگرێتـەخۆ یـان دیـواری خـەون یـان گومڕایـەکی ڕەهـەندو یـاخود دوکـەڵێکی سپی یـا موسـافیرێکی هەمیشـەیی ئەمەیان ڕەهایی لێکدانەوەی ئەوە دەڵێت فەنای موتلەق لەم سەر زەمینـەدا نایەتەکایـەوە مادامـەکێ بـــــەندە بـــــە نـــــەفس، واتـــــە مادامـــــەکی هـــــەر کەســـــەو نەفســـــی خـــــۆی لەگەڵدایـــــە یـــــا لاهـــــوت و ناســـــوت لـــــە مرۆڤـــــدا هەیـــــە چونکـــــە

یەکبوون بە روحەو بە جەستە نییە بەم جۆرە بوستامی بناغەی یەکگرتن و تێکەڵبوون و فەنای دانا لە نێو زاتی رەهادا ئەوەشیان لە رێگەی هاوکێشەیەکی سەخت کە مرۆڤی تێدا دەبێت بە رەهاو رەهاش دەبێتە مرۆڤ بەم جۆرە:

( هذا فرحي بك وانا اخافك، فكيف فرحي بك اذا امنتك )

( عرفت الله بالله وعرفت ما دون الله بنور الله عز وجل )

هەموو خەمباری بوستامی وەك عارفێك لەوەدا بوو كە تێرامانی بۆ دەكردو ئەو دەیگوت خەمی زاهیر بۆ خواردنە بەلاّم هی عارف بۆ تێرامانە.

( العارف همهُ ما يأمله والزاهد همهُ ما يأكله )

جارێکیان لە بایەزیدی بوستامی دەپرسن کە ئاخۆ سپێدەی چۆن کردۆتەوە لە وەلاّمدا دەڵێ نە سپێدەو نە ئێواران:.. سپێدەو ئێوارە بۆ ئەو کەسەیە کە سیفەت وەردەگرێ، رەهایی منیش کە هیچ سیفەتێکم نییە، سیفاتی عارف ئەوەیە کە سیفەتی هەقی تێدابێ‌و رەگەزی خوداوەندی پێدابڕوا، من نەمویست وەها بەدی بکەم وەڵێ رەهایی ویستی من بەدیبکات.

(٨)

(**محیەدینی عەرەبی**)[٢] تەونی رەهایی لە زوهدێکی بێ پایاندا دەبینێ هەرواش لە کوشتنی ئەو ـ نفس ـ دا لە دایکبوونی ئەم رەهاییە رادەگەیەنێ‌و لە سروتێکی ئەفسانە ئامێزدا رەهایی دەکا بە قەقنەس کە لە کوشتن و سووتانی خۆیدا لە دایکدەبێتەوە، ئەو کاتەش نەفس وەك کۆترێك لە شەققەی باڵ دەداو بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێ، لەگەڵ لێکدانی باڵەکانیدا نووری خوداوەندی پەخش دەکاتە فەزاو نێوان زەمین و ئاسمان پڕ دەکا لەو نوورە ئەوسا لەگەڵ ئەو رەهاییە تێکەڵ دەبێ، ئەو پێی وایە (**بوون بە هەق بە هۆی خەلقەوەیەو خەلقیش بە هۆی هەقەوەیە**) واتە هیچ جوداوازی‌و لێکترازانێك لە میانیدا نییە، لە مەزهەبی ئەو شێخەدا هیچ وجودێ نییە کە ئەو دژی نەبێ چونکە بوون گشتگیرەو سنووردارنییە هەر بۆیە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| **فلولاه ولـــولانا** | **لمـــا كـــان الـــذي كانـــا** |
| **فسار الامر مقسوماً** | **بايـــــــــاه واياـنـــــا** |

(**سەهرە وەردی**) هەمان ئەو رەهاییە لە جیلوەدا دەبینێ، جیلوەیەك کە هەموو کەس پەی پێنابات لە هەورە تریشقە دەچێت کە لە کاتی تەقینەوەدا هەموو ئەم زەمینە ئاوەدان دەکاتەوە، دلاّن تەژی لە عەشق و پەرستن دەکات، ئەو دەمی بۆ تێکەڵبوون لەگەڵ ئەو رەهاییەدا دەبێ بە جۆرێك لە بوورانەوەی خەڵوەتدا بێت کە نێوانت لەگەڵ بوونی ماتریالیدا نەمابێت و لە هەموو چڵکێکی ئەو سەر زەمینەدا دابڕابێت، ئەوسا لەگەڵ ئەو رەهاییەدا کە لە شێوەی جیلوەدایە دەبێ بە یەك و دنیای نوورانی رەهایی لە (**کـل**) دا بەرجەستە دەبێ.. (**محیەدین العربی**) پێی وابوو مرۆڤ لە خۆشەویستی‌و عیشق دەگاتە ئەو رەهاییە، شەوقێکە لە میانی تەجریدی سۆفیگەرێتی‌و بەرجەستەکردنی شیعری لە پانتایی یەکێتی ئاینەکان و باوەڕکردن بە ململانێی ئایینی‌و زێتر لە زەوقی سۆفییەکانەوە نزیکە.

**انـي اديـن بديـن الحـب انـى توجـهتُ**

## ركائبـه ، فــالحب ديــني وايمــاني

سـۆفیگەرێتی سـەهرەوەردی لـە گۆڕاندابـوو، زۆر جـاران لـە میـانی ڕەهـایی وەك مەبەسـت و غوربەت و وەك عیشق شوێنی خۆیان دەگۆڕییەوە بۆ نموونە سەیری ئەو شیعرەی بکە کە بە ناوی لە نزیك مەزاردا:

| | |
|---|---|
| اقول لجارتي والدمع جاري | واني رأيـت في الظـلام ضـوءاً |
| ولي عزم الرحيل عن الديار | كـأن الليـل زيـن بالنـهارِ |
| ويأتيني في الصفـاءِ برق | يذكرنـي بـها تـرب المـزارِ |

(٩)

(**محەمەدی کوڕی عەبدولجەبار**)[٣] کە بە (**النفـري**) ناوداره، لە گەڕان بەدوای دەسگیرکردنی ڕەهـاییدا پشـتی بـە مەنـەلۆژی نـاوەوەو بەیەکـەوە نووسـاندنی دەسـتەواژەکان، دەبەسـتاو لەقولاییەوە تروسکەکانی خۆی دەهاویشت، لەئاگاهیەوە بەرەو مەستیو لەبیرکردنی دەورووبەر کـە هـەرگیز بـەخۆ نەددهاتـەوە تـەنیا ئـەو کاتـەی دەسـتەواژەکان لـە سـووڕان دەکـەوتن و لێکدەترازان. بۆیەش خوێندنەوەی نیفەری لەدرنگە شەوان زیاتر تێکەڵ بوونی روح دروست دەکات لەوەی کە بەرۆژ بخوێندرێتەوە، نیفەری هەرگیز بەرۆژ شتێکی بۆ خوێنەر نەدەدرکاند، چونکە پێی وابوو لەرۆژدا خوێنەر داخراوەو نابێتەوە، نیفەری دەڵێت:( کاتی ئـەوە هـاتووە روخسارم وەدەرخەم و تەسبیحەکانم بخەمە روو نووری من تێکەڵی فەناو ئەو دیوی فەنابێ، ئەوسا ئەولیائەکانم فەرمانڕەوایی دەکەن.. ئاگر دەپرژێنن، ئیدی من لەنزیك وەدەرکەوتنمدا دەردەکەوم، ئەستێرەکان بەدەورمدا کۆدەبنەوە، مانگ و خۆر بەیەکەوە کۆدەکەمەوەو دەچمە هەموو ماڵێکەوە).

نیفەری لە قوولایی بیرکردنەوەی خۆیدا سەبارەت بەکەونێکی وابەرین و ئەو هەموو لێکدانەوەیە و دیدگایە گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە هەرچەند دیدو بۆچوون فراوان بێ دەستەواژەکان تەنگ دەبنەوەو شوێنی واتایان تێدا نابێتەوە..( **كلمـا اتسـعت الرؤيـة ضـاقت العبارة...** )

(١٠)

(**حەللاج**)[٤] بۆ ڕەهاییبوون و گەیشتن بە ڕەهایی باوەڕی بە نێوەندکاریو تێکەڵبوون نەبوو، چونکە بۆ تێکەڵبوون لەگەڵ ڕەهایی خوداوەندی یەکێتی بوون بوو بە پارسەنگی بابەتی ئەو پێی وابوو بەشەرییەت بەندە بەو ڕەهاییەوەو بوونیشی جیلوەی هەقی تیا دەردەکەوێ، هەروەها بەشەرییەت لەو ڕەهاییە جیاواز ترازاوە کە لە بنەڕەتدا یەك جەوهەر بووە ئەویش ڕەهایی یەکێتییە.. فەلسەفەی حەللاج لە گواسیندا ناخزێتە ژێر باری لۆژیك و دەستوور لە سوورەتی ئەرستەویدا حەللاج دەڵێت:

| | |
|---|---|
| يا سر سـر يدق حتى | يجـل عـن وصـف كـل حـي |
| و ظاهراً باطناً تـبدى | في كـل شـيء بكـل شـيء |
| يا جمله كل لست غيري | فمـا اعتـذاري اذن الى |

یەکێتی بوون بریتییە لە ڕاگرتنی ڕوانین لە نێو بوونی (**واجب الوجود**)دا واتە ئەو مەوجودە هەقە بریتییە لە واجب الوجود و، هەموو بوونەوەرەکانی دیکە سێبەرێکی لاوازو زەیف و وەهمە شایانی ئەوە نییە ناوی بوونی لێ بنێین لەبەربەرییە! هەر بۆیەش لەم شیعرەدا ( ڕوح مەخلوقێك نییە بەڵکو هەقیقەتێکە لە دنیای نەمرو سیفەتی ئیرادەو پێی وایە یەکێتیبوون بالاترین مەرتەبەیەو ئاوێنە تەنیا خۆرە هەتاوی تیایە).

(**نیکۆس کازانتزاکی**) لە کتێبەکەیدا بەناوی (**التصوف**)دا دەڵێت لە چاڵێکی تاریکەوە دێین و لە چاڵێکی تاریکی دیکەشەوە کۆتاییمان دێت مەودای نێوان ئەو دوو چاڵە پێی دەڵێین (ژیان) هەر لەو ساتەی کە لە دایك دەبین سەفەری گەڕانەوە دەستپێدەکات، دەستپێکردن و گەڕانەوە لە یەك کاتدایە، بۆیە ئامانجی ژیان مردنە، هەر کات لە دایك دەبین هەوڵ دەدەین خەلق بکەین و شت دابهێنین، هەموو ساتێك لە دایك دەبین بۆیە زۆر ئامادەین کە بڵێین ئامانجی ژیانی دنیا نەمرییە. لە جەستەی زیندووی فانیدا هەردوو تەوژم لە ململانێدان یەکیان سەردەکەوێ بەرەو ژیان و نەمری، ئەوەی تریان دادەبەزێ بەرەو لەبەریەکهەڵوەشانەوە، بەرەو ماتریال بەرەو مەرگ تا لە کۆتایی ئەو پەرەگرافەدا دەڵێت( کەواتە ئەرکی سەرشانمانە کە دەرك بە خەون بکەین، ئەو خەونەی دەتوانێ ئەو دوو هەڵچوونە گەورەیە بگرێتەخۆ، فەوزەوییەکان و بێکۆتاییەکان و شێلگیرییان هەر بەو خەونەش فیکرو سلوکمان ڕێکبخەین).

هەر لەم ڕووەوە حەللاج دەڵێت:

**انت بين الشغاف والقلب تجري**

**مثل جري الدموع من اجفاني**

یەکەمین کەسێ کە باس لە ئەڤینی خوداوەندی دەکات، کە بریتی بوو لە عیشق و خۆشەویستیو سوتان، (**ڕابیعەی عەدەویە**) بوو کە لە پێناوی پاکیزەکی عیشقدا ئەڤینی دەکرد. لەم ڕێیەشدا هەرچەند جارێ کە ویستوویەتی سووتانێ بەرپابووەو ئەویش ڕووی خۆی بۆ خۆشەویستی کردۆتەوە تا ببینێ کاتێکیش ئەویش ڕوخساری بۆ ئەو دەردەخات رایدەکێشێتە لای خۆیو نووری ئامادەگی دەیفرێنێ وەلێ لێی ون دەبیێو لە ئارادا نامێنێ.. هێندە لەو سووتانە دەگا بە خوا تا ئەوپەڕی بۆیە دەڵێت:

**(خودایە ئەو دڵانە بسووتێنێ کە تۆیان خۆشدەوێ)**

هەڵبەت ئەو لە ئاگر نەدەترسا بەڵکو ئەوە ئاگری عیشقی دڵی بوو.. ئەو دڵەی کە بە ئەڤین سووتابوو.. گوتاری ڕابیعە بۆ ڕەهایی بوو.. بۆ چوونە ناو نووری ئەبەدی بوو با سەیری ئەو نموونەیە بکەین:

**احبـــك حبـــين، حـــب الهـــوى**

**وحبـــاً لأنـــك اهـــل لـــذاكا**

**وامـــا الـــذي وحـــب الهـــوى**

**فشـــغلي بذكـــرك عمـــن سواكـــا**

**وامـــا الـــذي انـــت اهـــل لـــه**

**فكشـــفك لي الحجـــب حتـــى اراكـــا**
**فمـــــا الفضـــــــل في ذا وذاك لي**
**ولكـــــن لـــــك الفضــــل في ذا وذاك**

(١١)

پرسی سۆفیگەریتی لە نێو کوردان بریتی بووە لـە تێکـەڵکردنی بـڕواو تینـی ئـاین لەگـەڵ بیروبۆچوونی کـەونیو بیرکردنـەوە، لـە خـەڵقبوون، بـەڵام ئـەو لایـەنـەی کـە توانیویـەتی عیشـق تێکەڵبوون وحاڵ و مەقام دروستبکەن و ببێتە هەرێمی جەزبەی سۆفیگەریتی، لایـەنی عـەودالی یان دیوانەیی یان رەندی سۆفیگەرانەیە، هەر لە سۆنگەی ئەوەی کە دان بە حوکمی جوگرافیای ژیانیـان گۆشـەگیربوونە، دەسـتیان نەگەیشـتۆتە هـەموو ئـەو سـەرچاوانەی کـە پرتـەوی ئـەم جەزبەیان لا دەست دەکەوێت. بۆیە ئەگەر سەرنج بدەین هەندێ نموونـەی سۆفیگەریتی لـە نێو کورداندا هەیە زۆر تایبەتە بە خۆیان لە رووی موفرەدەو تیرمۆنۆلۆگیو شتی دیکە، وەك دەڵێن هـەمان کـەلتوورێکی ئـاوا تـا سـەدەی حەڤدەهـەم شـەفاهی بـووە بـەڵام (**ئەحمـەدی خـانی**) بـە تۆمارکردنی ئەڤیننامەی (**مـەم و زیـن**) هـەوڵێکی داو تـا رادەیـەك زمـانێکی یـەکگرتووی خسـتە ئاراوە، بە خەیاڵی بە تین و تاوی سۆفیگەرانەی، هەر بۆیـە لە نـاو خودی مـەم و زینـدا بە دەیـان نموونەی وا هەیە کە شەوقی سۆفیگەریتی تێدا تێکەڵ عەشقی رەهایی دەبێت و مرۆڤ دەخاتە ئەوپەڕی جەزبەوە، ئەحمەدی خانی هەندێ جار سنووری لە میانی مرۆڤ بە هـەموو جۆرو بیرو باوەڕو رەفتار نەدەهێشت و لـە یـەك مـەقامدا حسـێبی دەکـردن، سـەبارەت بـە رەهـاو جیـاوازی دەکردن هەر بۆیەش لە دوو دێردا بەم مانایەوە دەڵێت:

(مـەخلوقات هـەمووی، یەکـەم و کۆتایی باوەڕدارو بێ باوەڕ، هـەر هـەموویان بوونەتـە مەزهـەری گەورەیی تۆو خوداوەندێتی تۆ هەر لە رووی یەکێتی بووندا لەو مانایەدا دەڵێت:

( **تۆ ناتوانی حەیزێك لە شوێندا وەدەستبهێنی.. بەلام لە نێو گیانی مەخلوقاتەکانتدا نیشتەجێ دەبێت** ).

هەروەك زۆربـەی شـاعیرانی کلاسیك ئەحمـەدی خـانیش لـە رووی کاریگـەرێتییەوە دەچێتـەوە سەر شاعیرانی فارس بە تایبەت (**فەریدەدینی عەتتارو حافزی شیرازی**).

زۆربـەی شـاعیرانی کلاسیکی کـورد لـەنێو چوارچێوەی باوەڕێکی بـەتینی ئایینییـەوە بـەرەو نووری سۆفیگەریتی هەڵچوونە.. راستە لێکترازانی سۆفیگەریتی لەگەڵ خودی ئاین ئەستەمە، بـەڵام لـە وردبوونـەوە لـە زۆر دەقی سۆفیگەریتی راستی دەدۆزینـەوە سـەبارەت بـەم لێکترازانـە.. کلاسیکەکانی کوردی وەك (**جەزیریو مەحوی**) یاخود (**نالی**) لە رێگـەی ئـەڤینی مرۆڤـەوە چوونـەتە نـاو ئـەڤینی خوداوەنـدی، سۆفیسـتی گـەورە (**حـەللاج**) پایەیـەکی گـەورەی لـە نێـو ئـەدەبیاتی کلاسیکی کوردی سۆفیگەرانەدا هەیە، نابێ ئەوەش لە بیربکەین، کە (**سافی هـیرانی، موخلیـص، و مەلا خدری دەشتیو زۆرانـی دیکـە**) نموونـەی یـەکجار جوانی سۆفیگەرێتییان لە نێو دەقەکانیاندا هەیە، کە شایانی لێکۆڵینەوەن، سۆفیستەکانی کورد مرۆڤی کارەساتبارو سەرکێش بووینە لە نـاوەوەی خۆیـاندا بـەڵام ئـەو رۆحـە تەمەرودییـەی کـە لـە نێـو سۆفیسـتەکانی وەك (**حـەللاج و بوستامیوسەهرە وەردی**) دا هەبووە لە نێو کورداندا کەمتر بەرچاو دەکەوێت. زۆر جارانیش لە نێو کوردان تێکەڵی دروست بووە لە میـانی سـۆفیگەرێتیو دەروێشـگەرێتی کـە زۆر لـە یـەکجیان،

سۆفیستەکان لۆژیك تێکدەشکێنن و زمانی تایبەتی خۆیان دروستدەکەن و دیالۆژێك ئەنجام دەدەن لە بڕستی کەسانی دیکەدا نییە دروستی بکەن و دەچنە سەر لێواری فەلسەفە، بەڵام دەروێشگەرایان نموونەی پاشبەندیتیو تەبەعین خۆیان لە شێخی خۆیاندا دەبیننەوە، هەوڵی رەهایەتییان نییەو دەستەپاچەن لە زیکردا قوربانییەکانی خۆیان دەبەخشن و لە جەستەی شێخی خۆیاندا بەرجەستە دەبن.

**بۆ نووسینی ئەم باسە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:**


١-الزمان الوجودی، عبدالرحمن بدوی، بیروت.
٢-انوار الحقیقه، مباحث فی التصوف، سعید النورسی، بغداد.
٣-العرب والفکر العالمی، ١٩٨٨ العدد (٤).
٤-مدارات صوفیة، هادی علوی، دار المدی.
٥-تصوف، نیکۆسکازانتزاکی، منقذوا الآلهة، دار المدی.
٦-طبقات الصوفیة، عبدالرحمن سلمی ١٩٨٦ قاهیرە.
٧-ترجمان الاشواق،شیخ محیی الدینی العربی ١٩٨١.
٨-احمد خانی شاعراً وفیلسوفا، د. عزالدین مصطفی رسول.
٩-الشعر والصوفیة، کولن ولسن.


پەراوێزەکان

- Tragic - ترازیدی - کارەسات - الفاجع.

١-بایەزیدی بوستامی (خەڵکی بوستام)ە لە ٢٦١ی کۆچی مردووە.
٢-میحییەدینی عەرەبی لە ١١٦٤-١٢٤٠
٣-نفری لە سەدەی چوارەم ژیاوە کتێبی (مخاطبات ومواقف)ی هەیە.
٤-حلاج (ناوی حسین بن المنصور او المغیث)ـەلە بیضاء لە ئێران لە دایکبووەو لە عیراق ژیاوەو شەهید کراوە لە ٣٠٩ هیجری.

# هەزارەی سێ
# سەدەی سیستەمی ئاسۆییە...!

□ ئەورەس رەشید

بەرایی:

لە دوا مانگی ئەیلولی سەدەی (٢٠) کۆمەڵـەی گشـتی نەتەوەیـەکگرتووەکان دوا خـولی (٥٤)مینـی خـۆی بەسـت. لـەو سـەکۆ نێودەوڵەتییـەوە سـەرۆکی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا، سەبارەت بە بـارودۆخی نێودەوڵـەتی‌و رۆڵـی نەتەوەیـەکگرتووەکان و دەوڵـەتان بـیروڕای رامیـاری خۆیان راگەیاند، دەزگەو ناوەندە سیاسی‌و راگەیاندنە جیهانییـەکان لێکدانـەوەو لێدوانـی هەمەلایەنـەو جۆربـەجۆریان بڵاوکـردەوە... لـە کوردسـتانیش رۆژنامـەی برایـەتی بـەڕێز لاپەڕەکانی تەرخان کرد بۆ ئەو مەبەستە، لە ئاکامدا دوو راوبۆچوون ولێکدانەوەی جیاواز کەوتنەڕوو!

یەکەم: لێکدانەوەیەك ئەو وتارانەی بە سەرەتای لێکترازانی سیستەمی نوێی جیهان دایە قەڵەم..!

دووەم: راوبۆچوون و لێکدانەوەی تایبەتیم کە پێچەوانەی ئەوەی سەرەوەیە، بەڵکو ئەوەی لەو سـەکۆ نێودەوڵەتییـەوە راگەیـەندرا سـەرەتای تـەرزێکی نوێیـە لـە سیسـتەمی نوێـی جیهانی نەك لێکترازانی...!

لایەنگرانی بۆچوونی یەکەم، بە دەمارگیرییەکی زۆرەوە رەخنەی پلارئامێزیـان گرتبوو گوایە راو بۆچوونەکانم پشت بە بەڵگەی زانستی‌و واقیعی نابەستێ، ئەوان نـازانن لە کام تیۆری نێودەوڵەتی مەسەلەی شێوەی ستونی‌و ئاسۆیی دابەشکراوەو باسکراوە... ئەگـەر هـەبێت لـە چ سـەرچاوەیەکەوە ئەو دوو شێوەیەم وەرگرتـووە، یـان لـە دانـانی خۆمـەو... پرسیاریان کردووە ئایا لە واقیعی سیستەمی نوێی جیهان پراکتیك دەکرێت؟

هەروەها چاپکردنی وشەی (کسر)ی عـەرەبی بـە (کر) کـە کوردییەکەشـم نووسـیبوو (شکاندن)، ئەو هەڵەی چاپەیان کردە بەشێك لە وتارەکەیان.

وەك نووسیبوویان:

نازانن لـە چ فەرهـەنگێکی سیاسیدا ئـەم زاراوەیـە هەیـەو ماناکەشـی چیـەو؟ چـەندین پرسـیاریان لـە مامۆسـتایانی زانسـتی سیاسـی کـردووە، کـەس نـەیزانیوە!! مانـای چییـەو کەس سەری لێدەرنەکردووە..! لەگەڵ ئەوەی چەندین شتی دیکەیان باسکردبوو!؟

یان مەبەستەکە تەنیا پلارو توانج بووە، دوای ئەوەی بەراوردی راوبۆچوونەکانی د. شێرزاد نەجار، لەگەڵ راوبۆچوونەکانی من دەکات بە لۆژیك و تاقیکردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی.. ئەمە راستە ئەو هەڵەیەو لێکدانەوەکانیشی وەك لێکدانەوەی چیرۆکێك یان دەقێکی ساکار بە تێروانینی تایبەتی! لە کۆتاییدا دەڵێم: (خوێندنەوەکان ئەوە نیشان دەدەن کە لێکترازانەکە لە سیستەمی نوێی جیهاندا روودەدات، ئەمە سەرەتایەکەیەتی وەك د. شێزاد وگەلێك لێکۆڵەرەوە سیاسیەکانی کوردو عەرەب و هی دیکەش ئەم رایەیان هەیە ئەمەش لە دواڕۆژدا بەدیاردەکەوێت).

بیروبۆچوون و لێکدانەوەی جیاواز بارێکی ئاساییەو فاکتەرێکە مرۆڤ دەگەیەنێتە خاڵی مەبەست، بەڵام کەس لە ئاستی فیکری رۆشنبیری کەسێکی دیکە بەرپرسیار نییە، ئەگەر زیان نەگەیەنێت.

ئاستی زانیاریو روناکبیری کەسێك ساکارو سەرەتاو لاواز بوو، مانای ئەوە نییە خەڵکانی دیکەو بەرامبەر لەو ئاستە دابن و سەیر بکرێن وپێوانەی پێبکرێت.

یان کەسێك نەزانینی خۆی بکاتە بەڵگەی رەخنەو پلارگرتن کە زۆر لەگەڵ داب و نەریتی رۆشنبیریو رۆشنبیرانەوە نەگونجاو ودوورە!

لایەنێکی سەرەکی هەیە پێویستە لە نووسین و گفتوگۆکاندا بە وردی رەچاوی بکەین کە بابەت و بەشە جیاوازەکانی روناکبیری لێکجیابکەینەوەو تێکەڵی نەکەین، مەنهەجییەتی هەر بابەت و بوارێك تێکنەدەین، بەڵکو لەسەر بنەماو پایەگەکانی تایبەت مامەڵەیان لەگەڵ بکەین!

## شەرعییەتی مێژوویی:

سیستەمی باوو جێگرو ناسراو لە سەدەکانی بەر لە زایین و تا کۆتاییەکانی سەدەی (بیست) لە فەرهەنگی سیاسیدا، سیستەمی دەسەلاتی لوتکە یان ستوونی بووە. لێکدانەوەی تێگەی تیۆرە جیاوازەکان بۆ دەوڵەت و دەسەلات لە یەك مەبەستدا یەك دەگرنەوە، ئەویش پیرۆزیو سەروەرییەتی دەسەلاتی لوتکەیە لە چوارچێوەی دەوڵەت و کیانی سیاسیدا، بە هەر شێوازو رەنگێك بێت!

تیۆریستە تیۆکراتییەکان، دەوڵەت و دەسەلات .. بە هێزو تواناو دەسەلاتی خوا دەزانن.

فیرعەونەکان خۆیان بە خوا دەزانی کە لە خێزانی سێهەمدا ناوی خۆیان نابوو [٤] ئەو تێگەیە دوای دەیان ساڵ وردە وردە گۆڕانی بەسەرداهات.

لە سەدەی (٩)ی زاییندا پیاوێکی ئایینی وەك (تۆما ئەکوینی) وتوویەتی:

(دەوڵەت خواست و ئیرادەی خوایەو دەبێ خەڵك ملکەچی دەوڵەت بن).

تا دەگاتە سەر (هیگل) کە وتوویەتی:

(دەوڵەت ڕێگەی خوایە لەسەر زەوی‌و بەهایەکی ڕەهایە)

دامەزرێنەران یان خاوەن بیرۆکەی پەیوەستی کۆمەڵایەتی (العقد الاجتماعی) وەك: (تۆماس هۆبز، جون لوك، جان جاك ڕۆسۆ)، داوای دەسبەرداربوونی مافی هاووڵاتییانیان کردووە بۆ دەسەڵات و دەوڵەت، ڕاستتر لێکدانەوەیان بۆ دەسەڵات لەو پەیوەستەدا دیوەتەوە! ناوەرۆکی قوتابخانەکانی دیکە وەك : خێزان، هێز، دەسەڵاتییان لە هێزدا دەبینییەوە بۆ ملکەچیکردنی هاووڵاتییان، کۆمەڵ لەوانە (دیگی، کاوتسکی.. تا مارکسیزمەکان)! لەگەڵ ئەوانەدا چەندین بیرمەندی دیکە وەك: (مکیاڤیللی، کارل سمیت، مۆسۆلینی...) دەسەڵاتی سیاسییان لە هەموو بەهایەکی مرۆیی داماڵی، بە شێوەیەك کە سیاسەت و ئەخلاقییان لێکجیاکردەوە بە دوو بابەتی جیاوازییان داناوە! مافی مرۆڤ وەك کۆمەڵ بریتی بووە لە بوون و پاراستنی دەوڵەت و دەسەڵات بە هەر شێواز و ڕێگەیەك بێت وهیچ کارو فەرمان و ڕووداوێکیان لا خراپ نەبووە بۆ گەیشتن بە ئامانج.. تا ئەمڕۆ ئەو گیانە لە جەستەی زۆر ڕژێمدا زیندووەو هەڵپە دەکات لەو ڕوانگەیەوە مامەڵە لەگەڵ هاووڵاتییان، کۆمەڵ، چالاکی‌و بابەتە جیاوازەکان دەکەن!! هەرەسهێنانی ئەو سیستەمەی جیهانی کردبووە دوو جەمسەر کە چەندین پێکهاتەی نەتەوەیی و ئایینی خستبووە چوارچێوەی دەسەڵاتێکی لووتکە، بوارێك لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا نەمابوو لە سنووری خواست و ئارەزوو وبەرنامەی ئەو دەسەڵاتە بە دەربێت و دەربچێت.

هەرەسهێنانی ئەو سیستەمەو یەکلابوونەوەی دوو جەمسەری، پەیوەندی نێوان توندوتیژی‌و دەسەڵاتی شێواند کە ڕەوینەوەی تیۆرو تێگەی هێز و توندوتیژی‌و ڕەهای دەسەڵاتی سیاسی بوو. سەرکەوتنی مەعریفەو ڕەوشت بوو بەسەر لۆژیکی هێزی داپلۆسێنەرو سەرکوتکەردا ئەوەش ڕووداوێکی کتوپڕو لە ناکاو نەبوو، بەڵکو ئاکام و بەرهەمی خەباتی مرۆڤایەتی بوو.. بە نەتەوەو گەلان و کۆمەڵانی بندەست و چەوساوەو بیرمەندانی جیهان لە پاڵ گۆڕان و گەشەسەندنی بواری ئابووری سیاسی‌و فەرهەنگی‌و کۆمەڵایەتی هەروەها پێداویستی‌و حەتمییەتی نا یەکسانی‌و نا بەرابەری نێوان تێگەو ئاکاری دەسەڵات بووە لەگەڵ پێشکەوتنی زانست و مەعریفەی مرۆڤایەتیدا لە ناو کۆمەڵگە جیاوازەکاندا!!

## مەعریفەو دەسەڵات

مەهاتما غاندی وتوویەتی: ( نامەوێت شوورایەك بە دەوری ماڵەکەمدا چێبکەم وپەنجەرەکانی دابخەم بەڵکو خانوویەکم دەوێت شنەی ڕۆشنبیری جیهان بە ئازادی لەناویدا هەڵبکا بێ ئەوەی لە شوێنی خۆم هەڵکەنێ).

دەوڵەت و دەسەڵاتی سیاسی لەسەر ئەم سێکۆچکەیە وەستاوە.. هێز، سامان، مەعریفە، گۆڕانێکی زۆر بەسەر چەشن و و تێگەکانیدا هاتووە، ڕەهەندو شێوازی دیکەیان گرتووە کە مانای گۆڕانە لە جۆری یان تەرزی سیستەمەکەدا!

ونستۆن چەرچل وتوویەتی:

(ئیمپراتۆرییەتی پاشەڕۆژ لەسەر عەقل دادەمەزرێت)! شۆڕشی پیشەسازی گۆڕانیکی گەورەی لەگەڵ خۆیدا هێنا کە باروچەشنییەتی هێزی زەبرو زەنگ و توندوتیژی. وردە وردە، گۆڕی بۆ باریکی دیکە ئەویش یاسایە! تایبەتمەندی یاسا لەوەدایە کە هێزێکی یەکسانە، چونکە لە کاتی روودانی ناکۆکیو کێشە لە نێوان دوو دەسەلاتی سیاسی، ئابووری کە پێویست بە یەکلاکردنەوەو چارەسەردەکات، بۆ ئەو مەبەستە پەنا دەبەنە بەر هێزی یاسا، مانای بەکارهێنانی هێزی چەکە بەلاّم بە شێوەیەکی شاراوەو بێدەنگ!

بۆ وێنە: لە ئەمریکا، ئەو پارێزەرانەی وەکیلی گشتی کۆمپانیاکانن پێیان دەڵێن (دەمانچە بەکرێگیراوەکان)! دەشزانین کە ئەمڕۆ چەند دەزگەو ناوەندی یاسایی هەیە دەوڵەتان و ناوەندە ئابوورییەکان بۆ چارەسەری کێشەو گرفتی دوو لایەنە پەنایان بۆ دەبەن، وەك دادگەی نێودەوڵەتی لە لاهای، ئەنجومەنی ئاسایشی سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکان.. بەراورد بکەین لە نێوان هێزی زەبرو زەنگ و کاولکاری چەك و هێزی یاسا بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەو ناکۆکییەکان بە تایبەتی لە بواری کار، ئابووری، بۆمان دەردەکەوێت کە هێزی یاسا ساناترو باشترە لە هێزی چەك، ئەوەش مانای دۆزینەوەی ریگەیەکە ئامێرێکی دیکەی باشترە کە سامان و پارەیە، پارد ئەو ئاکامە دەست وبردە دەدات بە دەستەوە کە لوولەی تفەنگ دەیدات بەکارهێنانی پارە بۆ پاداشت و تۆڵەسەندنەوە لە هەردوو بارەکەدا ئاکامێکی باشتر دەداتە دەست لەودی کە توندوتیژیو زەبرو زەنگ دەیدات، چونکە لەگەڵ ئەمەشدا هەڕەشەکردن بۆ بەکارهێنانی توندرتیژی وەك زانراوە!

ئەوە ئاکامی گۆڕان و پێشکەوتنە. لە سەردەم و قۆناغەکانی دیکەدا کە زۆربەی کۆمەڵگەکان کشتوکاڵی بوون، بەشێك نەبوون لە سیستەمی پارەوپوول، چونکە پێداویستی ژیانی رۆژانەیان بە دەستی خۆیان دابین دەکرد، پارەو سامان ئامێرێکی سەرەکی نەبوو بۆ بالادەستی..

بەلاّم لە کۆمەڵگەی پیشەسازیدا پارەو سامان بۆتە ئامێرێکی سەرەکیو شوێنی توندوتیژی گرتۆتەوە بۆ بالادەستی، لەو پێناوەدا دوو بیرۆکەی جیاواز هاتنە ناراوەو کەوتنە ململانێ لە لایەك (جۆن بایربۆند مۆرگان) لە سەرووی ئەو رەوتەدا بوو بۆ لووتکەو دەسەلاتی لووتکە هەوڵیان دەدا، باوەڕیان بەو گریمانەیە بوو کە دەڵێت: (هەموو گرنگترە لەو بەشانەی لێی پێکهاتووە)! لە لایەکی دیکە (مایکل مێلکن) بە پێچەوانەوە لەگەڵ ئەو رەوتەدا بوو کە دەڵێت: (بەشە پێکهێنەرەکان لە هەموو گرنگترە) ئەوە ململانێی نێوان دەسەلاتی ستوونیو دەسەلاتی ئاسۆییە، ئەو دوو رەوتە جیاوازە هەر یەکەو بە کەرەستەو ئامێری خۆی خەباتی دەکرد لە ئاکامدا لە مەیدانی کارو پارەدا گۆڕانێکی گەورە لە دەسەلاتی ستوونیدا روویدا هەر لە بازاڕی (ۆلستریت) تا بەرهەمهێنانی کالاّکان کە هەمووی بەرەو بە جیهانیبوون یان بە شێوەی ئاسۆیی پەرەدەسێنێ وەك بازاڕەکانی پارە. قەواڵە کە چەشنی نوێتر پێشکەش دەکەن لە بەشداری پولیەی تەئمین و شیك.

لەگەڵ ئەوەشدا دروستکردنی ئوتومبیلێك یان ژمێریارێکی ئەلەکترۆنی لە چەندین وڵات پارچەکانی دروست دەکرێت و لە وڵاتێکی دیکە بەرهەم دەهێنرێت و دەخرێتە بازاڕەوە. بازاڕەکان بە جۆرێك فراوان بوون کە سنووری نیشتمانی وڵاتەکەیان تێپەڕاندووە. کۆمپانیا دامەزراوە ئابوورییەکان، داراییەکان بەرە بەرە بەرەوبە جیهانیبوون دەڕۆن لە باری ستوونییەوە بەرەو ئاسۆیی بە پەلە هەنگاو دەنێن، سەرجەمی ئەو چالاکییانە لە پێشبڕکێدان بۆ بەجیهانیبوون. وەك دەزاندرێ بانکەکان دەسەڵاتی لووتکەیی پارەو سامانن، بەڵام ئەو بارە بۆتە هۆی کەمبوونەوەی رۆڵی بانکەکان، بە تایبەتی کە سەرچاوەی داهاتییان لە پاشەکەوتی ئەو پارانەدایە کە لەو بانکانە دانراون، بازاڕەکانی سەرمایە بەرەو بەرفراوانیو یەکانگیری زیاتر دەڕۆن هەر لە هۆنگ کۆنگ و تۆکیۆ و پاریس و لەندەن و نیویۆرك...هتد ئەو بارە نوێیە بۆتە هۆی بچووکبوونەوە یان دابەزینی قەبارەو توانای هەر کۆمپانیاو دەزگەو کەسێك بە تەنیا، ئەوەش هاندەرو هۆکاری ئەو هەواڵانەیە کە رۆژانە چەندین کۆمپانیاو دەزگە یەك دەگرن و تێکەڵاوی یەکتری دەبن.

لە سەرەتای سەردەمی پیشەسازیدا دەسەڵاتی سامان لە دەستی ئەورووپا کۆببۆوەوە، دوای جەنگی دووەمی جیهانی بەرەو ئەمریکا رۆیشت، ئێستا بەرەو سەراپای جیهان دەڕوات و لە هاتووچۆ دایە، ئەوە پەرەسەندن و جێگیربوونی سیستەمی نوێی جیهانییە بەرەو دەسەڵاتی ئاسۆیی.

لە ساڵانی حەفتاکاندا دەوڵەتانی سەر بە رێکخراوی ئۆپێك بە ملیاران دۆلارییان لە ئەورووپاو ئەمریکا راکێشا بەرەو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەوەش بووە فاکتەرێك کە یارمەتی دەوڵەتی عەرەبیە خاوەن نەوتییەکانیدا رۆڵێکی کاریگەرییان هەبێت لە بواری رامیاریو وڵاتانی دیکەش بخەنە ژێر رکێفی ئەو کاریگەریە رامیارییەی دەیانەوێت، وەك وڵاتانی ئەفریقیا تاکو پەیوەندی دیپلۆماسییان لەگەڵ ئیسرائیل پێبڕی.

ئەو سامانە خۆی لەناو حساباتی بانکەکانی زیوریخ، نیویۆرك دییەوە لەوێوە بەشێوەی قەرز بەرەو مەکسیك، بەرازیل، ئەرژەنتین، دواتر بۆ تۆکیۆ و نیویۆرك...هتد هەموو جولان و هاتووچۆکردنێکی سەرمایە دووبارەبوونەوەی دەسەڵاتە لەسەر ئاستی ناوخۆو جیهانی، ساڵانی ١٩٨٧-١٩٨٩ بەڵگەی ئەوەن کە سیستەمی لووتکەیی لە کۆنترۆڵ دەرچووە، ئەو میکانیزمەی وەك زامن دانرابوو بۆ پاراستن و ئارامی دارایی لە بواری دەوڵەتاندا، بە تایبەتی ئابوورییە داخراوەکان رۆڵی ئەوتۆی نەماوە لە سایەی ئەو تۆڕە ئەلەکترۆنییە فراوانەدا کە دەتوانرێ لە ماوەی کەمتر لە چرکەیەك ملیاران لە پارەو سامان کۆبکاتەوەو دابەشبکات، ئەو خێرایە بۆتە فاکتەرێکی کاریگەر لە دابەشکردنەوەی قازانج و دەسەڵات، ئەوەی بەڵگەی سەلمێنەری ئەو راستییەن کە جیهان گۆڕانێکی ریشەیی گەورەی بەسەرداهاتووەو، مرۆڤایەتی بەرەو چەشنێکی دیکەی نوێ هەنگاو دەنێت و، بەشێکی ناتوانێ لەگەڵ خێرایی ئەو گۆڕانەدا بێت.

## جیهانگەرایی:

به مانا شکاندنی سنوورەکان، نەهێشتنی جیاوازی رەگەزی، رۆشنبیری، نزیککردنەوەی ماوەو نێوانەکان کە سەراپای لایەنی کۆمەلایەتیو شوێنەکان دەگرێتەوە. سەروەری نیشتمانیو دەسەلاتی رامیاری دەبەزێنێ، جۆرێك لە هێزی ئابووریو زانیاری دروست دەکات کە کاردەکاتە سەر هەموو لایەنەکانی ژیان لە جیهاندا، بەبێ ئەوەی دەسەلاتێکی رامیاری بە تەنیا شان لە شانی بدات، کە لە خۆیدا نەهێشتنی دەسەلاتی لووتکەیی ستوونییە، بەلکو بلاوبوونەوەو دابەشبوونێکی ئاسۆییە.

پەیوەندی مرۆڤایەتی هەمیشە لە پەرەسەندن دایە بە هەمان شێوە پەیوەندی دەسەلات لە گۆڕاندایە، ئامانجی سیستەمی نوێی جیهانی وەك لە ناوەکەیدا هاتووە تەنیا گۆڕینی یان نەمانی سیستەمێك یان کۆتایی ململانێی ئایدیۆلۆژی نییە، بەلکو وەرچەرخانێکی مێژوویی گەورەیە لە سروشتی رژێمی رامیاریو پەیوەندی کۆمەلگەکاندا، کە زیادەڕۆییو چەقبەستوویی لە دەسەلاتدا کارێکی خراپ و ترسناکەو قبولنەکراوێ، ئەو گۆڕانەش هەموو جیهان دەگرێتەوە کە بیرمەندان و لایەنگرانی جیهانگەرایی ناوی دەبەن بە بیرۆکەی پشت بەستن بە یەکتری، لە هەمان کاتدا شکاندنی بیرۆکەی پشت بە خۆبەستن و پاشکۆییە.

لە جیهانگەرایی وردبینەوە دەبینین چوار روخساری لە خۆگرتووە:

**١-زانیاری:**

بە شۆڕشی زانیاری ناودەبرێت. مەبەستەکە تەنیا گواستنەوەو ئاسانکاریو گەیاندنی زانیاری نییە بۆ فراوانترین و زۆرترین خەلك و دامەزراوە جۆربەجۆرەکان، بەلکو مەبەستەکە جیاکردنەوەی بەردەوامیو هەمیشەییە لە نێوان ئەوانەی زانیارییەکان دادەهێنن و دروستی دەکەن، ئەوانەی توانای بەکاربردنیان هەیە لەگەل ئەوانەی زانیارییەکان بەکاردێنن و سەودایی لەگەل دەکەن بە شێوەو توانایەکی سنووردار کە هەردوو لایەنی سەربازیو مەدەنی دەگرێتەوە.

**٢-گۆڕانی ریشەیی لە مەیدانیئابووریدا:**

ئەم لایەنە زیاتر بواری بەرهەم و بازرگانی دەگرێتەوە، بازاڕەکانی دراوی جیهانیو بوارەکانی خزمەتگوزاریو شمەك رۆلی سەرەکی دەبینێ، لە بەرامبەر ئەوەدا دەولەتان توانایەکی ئەوتۆیان نابێت و ناچار دەبن سەرلەنوێ نەخشەو هەیکەلی ئابوورییان دابرێژنەوە بەرەو جێبەجێکردنی رامیاری کەرتی تایبەت، لەگەل گەشەسەندنی ئابووری جیهانیدا بازاڕو دراو و سامان بەرەو پەرەسەندن و فراوانییەکی زۆر دەڕوا، بە پلەو رادەیەك کە قەبارەو توانای دامەزراو و کۆمپانیاکان بەرەو بچووکی دەڕوات، بۆ وێنە بەر لە چەند سالێك بانکی ناوەندی ژاپۆن دەیتوانی کاربکاتە سەر رێژەی نرخی دراوەکەی (یەن) بەرامبەر دۆلاری ئەمریکی لە رێگەی کڕین و فرۆشتن بەلام ئەمڕۆ ئەو برە لە چاو ئەو برەی رۆژانە لە بازاڕەکانی لەندەن. نیویۆرك. تۆکیۆ بە تەنیا سەودایی پێدەکرێت زۆر کەمەو

جێگەی گاڵتەیە، چونکە سەودایی ڕۆژانەی ئەو سێ بازاڕە لە ٢٥٠ ملیار دۆلار زیاترە کە ـە هەفتەیەکدا دەکاتە زیاتر لە تریلیۆنێك گەر بەراوردی بکەین لەگەڵ بازاڕەکانی جیهان ناگاتە ڕێژەی ١٥٪ .

لەسەر ئەو بنەمایە ڕۆڵی بانکە ناوەندییەکان و بانکە گەورەکان پێکەوە سنووردار بووە، لێرەوە دەسەلات لە دەست بانکە ناوەندییەکان و حکومییەکان دەردەچێت کە بۆتە فاکتەری ڕێکخستنەوەیەکی نوێ لە سەرووی دەسەلاتی نیشتمانیو سنووری دەوڵەتدا، ڕالبوونی بە جیهانیبوون مانای لاوازیو بێدەسەلاتی زیاتری بانکە ناوەندییەکانە، ئەو فاکتەرو هاندەرەی یەکخستنی دراوی ئەوروپییە لە (یۆرۆدا) هەروەها دامەزراندنی بانکی ناوەندی ئەوروپی، لە ئاسیا لەسەر هەمان بابەت لێکۆڵینەوە هەیە، دەوڵەتانی کەنداوی عەرەبی لەو بارەیەوە مشتومڕ دەکەن.

٣-نوێکردنەوە لە بواری ڕۆشنبیریدا:

جیهانگەرایی کاریگەرێتی لەسەر تاك و کۆمەڵ هەیە بە هەموو جیاوازیەکانییەوە، لە هەر پلەو دەسەلات و قەبارەیەکدا بن، چونکە ڕەنگدانەوەی لەسەر لێکدانەوەو بەهای ڕامیاریو کۆمەلایەتی بە تایبەتی لەو کۆمەڵگەیانەی کە فرەنەتەوەییو مەزهەبین یان لێکچوونی ئایینیو ڕەگەزییان هەیە جیاوازە وەك وڵاتانی ئاسیاو ئەفریقیا کە جێی فەرهەنگ و ڕۆشنبیری تایبەت بە هەر کۆمەڵ و ناوچەو تایفەیەك هەیە، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی سەلەفییەتی ئایینی ڕەگەزی توندڕەو ئەگەر ئەو هێزانە پێکەوە هەڵنەکەن و هاوکاری لە چاکسازیو گەشەپێدانی دیموکراسییەتدا نەکەن.

٤-لە بواری پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکاندا:

نزیکبوونەوەی کات و شوێن لە نێوان نەتەوەو گەلانی جیاوازدا دیاردەیەکی گەورەو نوێیە لە مێژوودا، دوای کۆلۆنیالییەتی سەدەی ١٩ سێ جەنگی جیهانی دووانی گەرم و یەکێکی سارد لە سەدەی بیستدا لە کۆتاییەکانی ئەو سەدەیەدا پێوانەیەکی نوێی هێنایە ئاراوە کە بریتییە لە شەپۆلی دیموکراسییەت، ئازادیو مافی مرۆڤ بۆ بە شارستانیکردنی کۆمەڵ و پەیوەندیو هاوکاری نێوان گەلان و وڵاتەکان، ئەوانە بوونەتە پرەنسیپ و یاسایەك لە بواری پەیوەندی نێودەوڵەتیدا، سەوداو پێوانەی لەسەر دەکرێت و بوونەتە بەشێك یان فاکتەرێك بۆ نەهێشتنی ڕەهایی سەروەری دەسەلاتی ڕامیاریو دەوڵەتی لەسەر ئاستی ناوخۆو دەرەوەدا.

لە حوزەیرانی سالی ١٩٩٣ کۆنگرەی جیهانی بۆ مافی مرۆڤ لە ڤییەننا بەسترا سەرۆکی وەفدی وڵاتە یەکگرتووەکان (وارن کریستۆفەر) وەزیری دەرەوە گوتی: (خراپترین پێشێلکاریەکانی مافیمرۆڤ لە جیهاندا ئەوانەن کە دەستدرێژی دەکەن و ئەوانەی هانی بلاوبوونەوەیچەك دەدەن و هەروەها داکۆکی لە بەجیهانیبوونی مافی مرۆڤ دەکەن بە شێوەیەکی لێکچوو وبێ لێکدانەوەی جیاوازی).

لە دوا سـاڵی سـەدەی بیسـتەمدا لەسـەر ئاسـتە باڵاکـانی جیـهان مـافی مـرۆڤ، سەربەخۆیی تاك رەگەزی چەندین جار دووپاتکرایەوەو یەکسانکرا بە سەروەری دەسەڵات، هەنگاو بەرەو ئەوە دەنێت کە ببێتە چەمکێك دەوڵەتان لەسەری رێك و هـاوکۆك بن چونکە دەوڵەتان لەسەر چەمکێك رێککەوتوون کە پێویستە وڵات لە خزمەتی هاوڵاتییاندا بێت.

## گۆڕان لە سروشتی دراودا:

ئەم سەدەیە ململانێیەکی زۆر دەبینێ لە نێوان لایەنگرانی بە جیهانیبوون و لایەنگرانی پاراستنی سـەروەری نیشتمان و دەسەڵاتی رامیـاری، کە لـە خۆیـدا ململانێیـە لـە نێـوان سیسـتەمی پیشەسـازیدا کـە لـە گیانـەلا دایـە،لـەم روانگەیـەوە دارِشـتنەوەی دارایـی نێودەوڵەتی لە چەند دەیـەی داهـاتوودا دەبێتـە هـۆی لـەناوچوونی هـەندێ هێـزی گـەورەی ئەمڕۆ ئەگەر لە سروشتی سەرمایەو ساماندا شۆڕش روونەدات، کرِینـی بەشـی کۆمپانیـاو دامـەزراوێك یـان بەشـداریکردن بـە پشـکێك ناگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو بنـەما ماددییانـەی ئـەو کۆمپانیـاو دامەزراوانـە وەك خانووبـەرە، ئـامێرو کەلوپـەلی بـاش، بـەڵکو دەگەڕێتـەوە بـۆ پەیوەندیو هێزو توانـای فرۆشتن و جـۆری بـەڕێوەبردن و رێکخسـتنی کاروبـارو توانـای داهێنان، ئەوە گۆڕانێکی نوێیە بەسەر سەرمایەدا هاتووە ئەو تیۆرانە تێکدەدات کە بنەمای ئایدیۆلۆژیای مارکسیو ئابووری کلاسیکی پێك دەهێنێت، هەردووکیان لەسـەر سروشـتی سەرمایە وەستاون، کە تا ئـەمڕۆ چـەندین گۆڕانـی بەسـەردا هـاتووە هـەر لـە زێـڕو زیـوو تـا توتن و مرواریو کوتاڵ...هتد.

ئەو گۆڕانە لە بازاڕەکانی جیهانیدا بە ئاشکرا دیـارەو بـەرەو پەرەسـەندن دەڕوات وەك ئـەوەی لـە ئـەمریکا، بـەریتانیا، فەرەنسا، ژاپـۆن رۆژانـە بـە ملیـاران دۆلار دێـت و دەچێـت بەڵام بـە شێوەی جیـاواز کـە پێیدەڵێن (الاوراق المالیە) وەك قەواڵـە لـەو چەشـنە کۆبۆنێك بەکاردێت کە ناوی کۆبوونی باوەڕپێکراوە کە ئەمە زۆر بە فراوانی بەکاردەهێندرێت.

دوای ئەوە کۆبۆنێکی دیکە هاتـە ئـاراوە بـە نـاوی کۆبۆنـی زیـرەك دەدرێتـە ئـامێری ئەلەکترۆنی بە خێرایی نرخی ئەو شتومەك و کەلوپـەل و پێداویسـتییانەی کڕیوتـە لەسـەر حیسابەکەت دادەبەزێنێو دەیگواستەوە بۆ حیساباتی ئەو شوێن و کەسانەی کە کڕیاریان بوێت، هەموو سەوداکردنێکی دراوی لـە ژیـانی رۆژانـەو چالاکیـەکانی دیکـەی مرۆڤدا بـەو چەشن و جۆرە دەبێت، خولەك لەدوای خولەك ئـەو ئالوگۆڕە بەرِێگـەی تۆڕێکـی ئـەلیکترۆن ئـەنجام دەدرێـن، کەهاوشـانی پێشـکەوتنی تەکنەلۆژیـە، ئـەوەش گـۆڕان و گواسـتنەوەی سیسـتەمی داراییە لەبەرهەمهێنانی جار جارە بۆ بەرهەمهێنانی بەردەوام و نەوەسـتاو و خـێرا کـەپێی دەڵێـن لەکـاتی خـۆی دا (Real Time) دوای کـۆبۆنی زیرەکـتر دروستدەکەن کەناویان ناوە: بانکی ئەلەکترۆنی لەناو جزدانەکەتدا (SUPER SMART CARD) لەوەشگرنگتر لەدانانی کۆبۆنێکی دیکەدا تایبەت بەمنداڵان، بەجۆرێك بەرنامەرێژ کراوە

کەباوکان دەتوانن جۆرو چەشنی خواردن و خواردنەوەی منداڵەکانیان دیاریبکەن. دەتوانن بچنە سەیرو تەماشای ئەو فیلمە سینەمایانەی لەگەڵ تەمەنی منداڵدا ناگونجیٚو شایستە نییە کەناویان ناوە ( پارەی بەرنامەڕێژکراو).

لەهەندێ وڵاتدا وەك ئەمریکا پارە بریتی نییە لەکاغەز یان پارچەیەکی کانزایی، بەڵکو پێکهاتووە لە چەند ژمارەیەك وەك کۆدی( فاکس) ناویان ناوە پارەی ئەلیکترۆنی کەلەپاشەڕۆژدا جێگەی پارەی کاغەز دەگرێتەوە ئەو گۆڕانە لەجیهانی پارەو پوولدا، ڕۆڵ و جێگەو دەسەلاتی بانك و سەرچاوە داراییەکان وەك خۆی نامێنێت کە لەلایەن حکومەتەکانەوە قورخ کراون.

ئەو دەسەڵاتە ستونییە نامێنێت کە ئەوانە لەلوتکەی دەسەڵاتدان و کۆنترۆڵ بە دەسەڵاتی سیاسیو چەشنی ڕژێمەکەوە دەکەن.

لێرەدا کێشەیەکی کۆمەڵایەتی ئابووری هەیە کەڕەنگدانەوەی لەسەر بواری رامیاری هەیە، ئەویش بێکاریە.

بێکاری:

لەگەڵ ئەو بارەدا بێکاریش گۆڕانی بەسەردا هاتووە لە چەندایەتییەوە بۆ چۆنایەتیو کەمکردنەوەی بێکاری بە ڕێگەی زیادکردنی بواری کارکردن وەك جاران نایەتەدی بۆ وێنە ئەگەر بانگەواز بۆ (٥) کاری نوێ کرا بۆ هەر بێکارێك ئەو کەسە بێکارە ناتوانێ ئەو کارە بگرێتە ئەستۆ ئەگەر تواناو شارەزایی نەبێت و ناتوانن ئەو شوێنە پڕ بکەنەوە.

لە داهاتوودا ئابووری پشت بە زانیاری دەبەستێت بە پلەی یەکەم ئەوسا بە بواری دیکە، بواری خزمەتگوزاری هەمان ڕێزو پلەی هەیە کە بواری پیشەسازی هەیەتی، لەبەر ئەوە زیادکردنی کارو بەرهەمی خزمەتگوزاری داهێنانی شێوەی نوێو ڕێکخستنی هێزی کارو بەرهەمهێنان ئەرکی داهاتووە. دابەشبوونی ئابووری بۆ کەرتەکانی پیشەسازی، کشتوکاڵی، خزمەتگوزاری بەو تایبەتییە نەماوە چونکە ئەرك و کارو فەرمانەکان تێکەڵ بە یەك بوون جووتیارێك کرێکارێك، کارمەندێك، ئاتاجی بە چەشن و جۆرو کەرەستەو ئامێری نوێ دەبێت کە تا دوێنێ پێی نامۆ بووە لەبەر ئەوە سەندیکاو ڕێکخراوە جۆرەبەجۆرەکانی پیشەی هونەری کارو بەرنامەیان دەگۆڕدرێت لەبەر تێکەڵ بوونی چەند کارێك بە یەك کە بەشێکی لە چۆنایەتی بەڕێوەبردنیدا پێویستی بە کاری هزرییە، ئەوانە بەشێك لە کاتیان بەسەر دەبەن بۆ بەرهەمهێنانی زانیاریو دابەشکردنی ئەوەش بەو جیهانیبوونی هێزی کارە لە ڕوخسارە دیارەکانی دروستکردنی بواری کارەکانی نەبینراو، کە خەڵکانی شارەزاو بە توانا کاری تیادا دەکەن، باشترین ئامێرو کەرەستەی تەکنەلۆژی تیایە ئەوانەی لەو ئاستەدا نین لەو بازارە دوورن. بەو جۆرە کاری بازوو کەم دەبێتەوە، بە کەم بوونی ئەو جۆرە کارانە لە بواری ئـ بووریدا کرێکار دەبنە کەمینەیەك چینێکی دیکە جێگەیان

دەگرێتەوە پێیان دەڵێن (کۆجنیتاریا) بە واتا ئەو چینە شارەزاو تێگەیشتووە لەگەڵ زانیاری مامەڵە دەکات.

لە فەرهەنگی ئابووری رامیاری داهاتوودا پرۆلیتاریا دەبێت بە کۆجنیتاریا، لایەن و کەرتەکانی چالاکی ئابووری دابەشدەکرێن یان ناو دەبرێن بە گوێرەی رێژەو پلەی زانیاری وەك ئەوانەی خاوەن: زانیاری فراوان، یان زانیاری مامناوەندی، سەرەتایی کە هەریەك لەوانە ئایدیۆلۆژیای خۆی دەبێت، ئاستی رۆشنبیری‌و پابەندبوون بە کۆمەڵێك داب و نەریتەوە کاریگەرییەتی لەسەر ئەو رەوتە دەبێت، کە تا ئێستا وەڵامی ئەو پرسیارە نەدراوەتەوە، ئایا ئەو گۆڕانە کێشەی بێکاری چارەسەردەکات بە تایبەتی شێ .ی کاری (Teletravail) واتە کارکردن لە دەرەوە کە ولأتانی وەك کەنەدا، ئەڵمانیا، ئەرەنسا، ئەمریکا هەر یەکەی بە رێژەیەك پەیرەوی دەکەن.

مایکل مێلکن دەڵێت: سەرمایەی مرۆیی جێگەی ئەو سەرمایە دەگرێتەوە کە لە دۆلار پێکهاتووە.

بۆمان دەردەکەوێت کە بەر لە هەموو قازانجێك لە هەر شێوەیەکی ئابووریدا پشتبەستووە بە سەرچاوەکانی دەسەلأت کە پێکهاتووە لە : هێز، سامان، زانیاری، زانیمان هێزی توندوتیژی گۆڕاوە بۆ یاساو سەرمایەو سامان و پارەش لە گۆڕاندایە بەرەو زانیاری هەروەها کار لە گۆڕاندایە وەك هێڵێکی هاوتەریب کە پشت بە هێماکان دەبەستێ.

## لە بیرۆکراتییەتەوە بۆ دیموکراسیەت:

شکاندنەوەی دەسەلأتی ستوونی‌و کشانی بەرەو ئاسۆیی سەرجەم ئەو تێگەو بنەمایانەی گۆڕی کە دەسەلأتی رامیاری بەکاریدەهێنا وەك بیرۆکراتییەت کە ئەمڕۆ بەرەو گۆڕان دەچێت، دەبێت لە سیستەمی داخراوی لووتکەیی بێتە خوارێ، چونکە سەلمێندرا کە دیموکراتییەتی بەناو ژیرانە وێنەیەکی ساختەیە لە دەسەلأت و پێچەوانەی ئاوەزو ژیربیژی ژیانی نوێیە چونکە دەسەلأتی بیروکراتی داخراو لووتکەییەو داهێنان لە ناودەبات. لەم سەدەیەدا بیروکراتییەت ناتوانی ئەو ئەرکەی خۆی ببینێ کە لە پێناویدا دروستبووە لە چوارچێوەی هەر رژێمێکی سیاسیدا دیموکراسی بێت یان نا پێویستە بەشێك لە گونجاندن لە نێوان ئەو ریگەو کەنالأنەی خەڵکی سامانی تیا بەرهەم دەهێنن لە نێوان ئەو شێوازو رێگەیەی کە حوکمیان دەکات هەبێت.

ئەگەر هاتوو سیستەمی رامیاری جیاواز بوو لەگەڵ سیستەمی ئابووری ئەوە لایەکیان ئەوەی دیکە لەناو دەبات چونکە پێکهاتەی هاوکێشەیەکن کە پەیوەندی بە دەسەلأت و شێوەی سیستەمی رامیاری جیاوازبوونیان و واتای تێکچوونی هاوکێشەکەیە، لە دەسەلأتی رامیاریدا هێزو سەرمایە پێویستی بە سەرچاوەی دیکە یا تەواوکەرێکی دیکە هەیە کە زانیارییە، لەسەر ئەو بنەماو زەمینەیە پێویستە توندوتیژی‌و سەرمایە بەرگی

ـيموكراسييەت بپۆشن و كاژی بیروكراتییەت دابمالن. چونكە ئەو سەرچاوەیە جاران بە دەستی چەند دەولەتێكەوە بوو بەلام ئەمڕۆ بە شێوەی دیموكراسییانە بە پێی قۆناغ و گەشەسەندنی باری كۆمەلایەتی رامیاری كەلتوری دابەشبووە وەك ئامارژەی پێكرا لەسەرەوە.

## تەرازووی هێز Balance of Pawer

خوێندنەوەی هاوكێشەكان و پێوانەكردنی تەرازووی هێز ئەوەمان بۆ دەردەخات دەتوانین دەولەتەكان یان هاوپەیمانەكان دابەشبكەین بۆ سێ بەش ئەوانەی هێزیان دەگەڕێتەوە بۆ یەكێك لە سێكوچكەی دەسەلات یان بۆ دووان لەوانە یان بۆ هەرسێكیان، كاتێ سەیری هێزی تەرازوو دەكەین بەو پێیەی جیاوازە لە تەرازووی هێز دەبینین هێزی ولاتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا بە درێژایی جەنگی سارد لە هەرسێ لاوە پێوانەی تەرازووی تەواوە چونكە خاوەن تەنیا هێزی سەربازی نییە بەلكو دەسەلاتێكی ئابووری گەورەو باشترین بنەمای مەعریفی لە جیهاندا هەیە. بەلام هێزی روسیا تەرازوو نییە چونكە توانای تەنیا لەسەر هێزی سەربازییەو لە بواری ئابووریشدا شل وشێواوە كە ئەمڕۆ لە سیستەمی جیهانیدا شوێنەوارو توانای نییە، لایەنی تەكنەلۆژیا لە ئاستێكی ئەوتۆدا نەبووە لەبەر ئەوە بە روسیای ئەمڕۆ دەگوترێت یەك لاق، ژاپۆن دەولەتێكە یەك لاق، ئەویش سامانە بەلام لە هەولی ئەوەدایە هێزی تەرازووی تەواو بكات، هێزی سەربازی ئەمڕۆی ژاپۆن بەرەو تەواوكەری دەڕوات بە شێوەیەك كە پێویستی بە هێزی سەربازی ئەمریكا نییە، بەلام كشانەوەی هێزی سەربازی ئەمریكا دەبێتە هۆی زیادبوونی یەكسانیو كەمبوونی هەلاوسان لە بودجەی ئەمریكا، نرخی دۆلار بەرزدەبێتەوە نرخی یەن دادەبەزێت، ژاپۆن ناچار دەبێت بۆ كڕینی زیاتری نەوت كە بە دۆلارەو پاشەكەوتی ژاپۆن كەم دەكاتەوە، ئابووری ژاپۆن لەسەر بالۆنیكی گەورەی خانووبەرەو كەلوپەل راوەستاوە كە بە دەرزییەك دەتەقێت لە بواری زانیاریشدا هێشتا نەگەیشتۆتە ئاستی پێویست چونكە سەرمایەكی زۆر خەرج دەكات بۆ كڕینی مافی داهێنان و رێگەپێدان و نرخی سێ ئەوەندەی ئەو پارەیە كە لە فرۆشتنی بەرهەمهێنانی خۆیدا دەستی دەكەوێت، لە٦٠٪ ئەو پارەیە دەچێتە كیسەی ئەمریكا. ژاپۆن لە دروستكردن و بەرهەمهێنانی تەنكۆلەی ئەلەكترۆنیدا زۆر پێشكەوتووە بەلام لە باری بەرنامەڕێژیدا زۆر لاوازە دەبێ ئەمریكا ئەو بەرنامەیە رەنگڕێژ بكات.

ژاپۆن لە سیستەمی خوێندن لەو ئاستە زانیارییەدا نییەو كەنالەكانی راگەیاندن لەچاو ئەمریكا وئەوروپادا دواكەوتووە، لە بواری ناردنی رۆشنبیریدا كاریگەرییەتی نێودەولەتی نییە چونكە زمانی ژاپۆنی رێگرەو خۆیان رێگە نادەن هەندێ زاراوەیان وەربگێڕنە سەر

زمانەکانی دیکـە، ٢٤ هـەزار قوتـابی ژاپۆنـی لـە ئـەمریکا دەخوێنـن و ڕێژەکـەش لـە زیادبووندایە کەچی تەنیا ١٠٠٠ قوتابی ئەمریکی لە ژاپۆن دەخوێنن. ئەوروپا بنەمایەکی ئابووری بەهێزو گەورەی هەیە کە یارمەتیدەرە بۆ هێزێکی سەربازی گەورە لە پاشەڕۆژدا، داهاتی نەتـەوەیی ئـەورووپای ڕۆژئاوا یەکسانە بـە داهـاتی نەتـەوەیی ئـەمریکا. ئـەوەندەو نیوێکی داهاتی ژاپۆنە کە پشکی لە بازاڕی بازرگانی جیهانیدا بە ٢٥٪ لە ئەمریکاو ژاپـۆن زیاترە، لە بواری زانیاری زۆربەی زاناو پسپۆرانی ئەمریکا لـە وەرگرانـی پاداشتی نۆبڵن، بەناوبانگترین پەیمانگـەو ئـەکادیمیای لێکۆڵینـەوەو خـاوەنی وزەی ئـەتۆمی‌و ڕۆبۆتـە، لـە بواری هزرو ئایدیۆلۆژیشدا سەرچاوەی چەپگەرێتی‌و وجودی‌و بونیادگەرایی‌یە پێشڕەوە لە داهێنان و پێشخستنی بەرهەمی ڕامیاری نوێدا. وێنەی ئەو بەرهەمە ڕامیارییەی ئەمڕۆ کە دیموکراتییـەتی کۆمەڵایەتییـە کـە ئـەمریکاو ڕوسـیاو ژاپـۆن گرنگـی زۆری پێـدەدەن هـەر لەوێشەوە ڕێگەی سێیەم خەریکە جێگەی خۆی خۆش دەکات، مرۆڤ لە تـەنگژەی هـزری‌و ئایدیۆلۆژی ڕزگاردەکات. لە ناوەندە هزری و بیرییەکاندا قسە لەسەر ڕاستییەك دەکەن کە ژاپۆن هەوڵ بۆ پاشـەڕۆژ دەدات، ئـەمریکا دەڵێـت نـان ئـەو نانەیە ئەمڕۆ لە خوانە کـەچی ئەورووپا بە یادی جارانەوە دەژی.

ئەوە واتای نابەرامبەریە لە تەرازووی هێزدا، چونکە هێزی سـەربازی ژاپـۆن و ئـەوروپا هێشتا هـێزی ناوخۆییـە یـان ناوچەییـە، توانایـان سـنووردارە کـە نـاتوانن لـە دەرەوەی سنووردا ڕۆڵ ببینن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەورووپا لە بواری زانیـاریدا کێشـەو گرفتـی هەیـە کە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتە لاسەنگییەکی بۆ دروستکردووە، لە بواری زانیاریشدا وەك ژمێریـاری ئەلـەکترۆنی تـەکنیکی زانیـاری دروسـتکردن وبەرنامـەڕێژی تەنکۆڵە ئەلەکترۆنییـەکان لـەو ئاستە پێویستییەدا نییـە، ئـەڵمانیا لـە پێشـەوەی وڵاتـانی دیکـەی ئەورووپادایـە لـە ڕووی تەرخانکردنی بۆدجە بۆ لێکۆڵینەوەو پشکنین.

لێرەوە دەگەینە ئەو ئاکامەی کە دەسەڵات بریتـی نییـە لـە چەندایـەتی بـەڵکو لە ڕووی چۆنایەتیش دەسەڵات کەمتر نییە لە چەندایەتی، ئەمریکا پابەندە بە ڕۆڵی نێودەوڵەتییەوە بە پێچەوانەی ئەورووپاو ژاپۆن چونکە لـەو بارەیـەوە خـاوەن مێژووە، لەبەر ئـەوە لـە ڕووی سایکۆلۆژیاوە زۆر گرانـە ئـەمریکا بچێتـە قـاوغی ناوچـەیی جگـە لـەوەش ئابووریەکـەی بەسـتراوە بـە چـەندین بەشـی جیـاوازەوە لـە جیـهاندا هـەروەها پشـتی بەسـتووە بـە پەیوەندییەکی زۆر فراوان، دابـڕان لەوانـە دەبێتـە کارەسـات و ئـەو ڕواڵەتـەی ئـەمڕۆ لـە پاشەڕۆژدا ئەورووپاو ژاپۆن دەگرێتەوە.

### کۆتایی سیناریۆکان

سەبارەت بە پاشەڕۆژ چەند گریمان و پێشبینییەك هەیە لەوانە تیۆری (پۆل کیندی) کە پێوانـەی هـێزی نیشـتمانی تـەنیا بـە سـامان و سـەربازی دەکـات، باسـی کاریگـەرێتی

ئایدیۆلۆژیا، ئایین، رۆشنبیری دەکات که لەمەودوا برەوی زۆری دەبێت ئەو تیۆرە رۆڵی زانیاری وەلاخستوە که هیچ گرنگییەکی نییەو باسی رووخانی هێزە گەورەکان دەکات. جگە لەوە ئەمڕۆ چەندین وڵات هەوڵ دەدات بگاتە ئاستی باڵا لەو پێناوەدا رەنگە هاوپەیمانی بۆ ستراتژییەتی دیکە سەرهەڵبدات ئەگەرهاتوو ستراتیژییەتی ئەمریکا دووچاری کورتبینی هات و بووە هۆی گەڕانەوەی مێژوو بەرەو رووکردێکی دیکە وەك دابەشبوونی جیهان بەرەو هاوپەیمانێتی ئابووری لە نێوان ئەورووپاو ژاپۆندا، ئەو کاتە کۆمپانیا گەورەکانی ژاپۆن بارەگەو نووسینگە سەرەکییەکانیان دەگوێزنەوە بۆ بەرلین لە ئەڵمانیا، پەیوەندی توندو هاوبەش لە نێوان کۆمپانیاکانی ئەو دوو دەسەڵاتە دەبێتە گوشارێك که ئەمریکا ناتوانێ خۆی لەژێر باری رابگرێت، ئاکامەکەشی وەك پاشماوەی جەنگە جیهانییەکان دەبێت. بەڵام هاوپەیمانێتی ئەمریکاو ژاپۆن ئاکامێکی پێچەوانە دەدات، چونکە پەیوەندی نێوانیان هیچ کاتێك لەوە خراپتر نابێت که لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە هەیانبوو، هیچ ئەگەرێك نییە بۆ تێکچوونی ئەو دەسەڵاتە که بگاتە ئەو ئاکامە.

ئەگەر جیهان بەرەو ئەو تێکچوونە رۆیشت ئەوا ترسێکی گەورە دروستدەکات هەتا لە لای ئەوانەی که زۆر بێزارن لە ئەمریکا، ئەگەر هاتوو هاوپەیمانێتی لە نێوان ئەورووپاو ئەمریکا بوو بە بێ ژاپۆن واتای ئەوەیە هاوپەیمانی رەگەزی سپییە لە جیهاندا که ئەوە بەرەو کزبوون دەروات، بەڵام هاوپەیمانێتی نێوان ژاپۆن و ئەمریکا مانای هاوپەیمانی رەگەزییە که هەموو گەلانی جیهان دەگرێتەوە، رەنگدانەوەی گونجاندن و ئالوگۆڕی زۆرە لە دەسەڵاتدا لەوانە ئەگەری جیابوونەوەی ناوچەکانی خوارووی رۆژهەڵاتی چین که ناوەندی پیشەسازین و جیابوونەوەیان لە ناوچە کشتوکاڵییەکان و پێکهێنانی جۆرە کیانێك لەگەڵ هۆنگ کۆنگ، تایوان، سەنگافوورە، کۆریا که شان دەدات لە شانی ژاپۆن.

دەتوانرێ بیر لە سیناریۆی دیکە بکرێتەوە، چونکە جیهان لە دابەشکردنی خواردن لە لایەن ئەمریکاو ژاپۆن و ئەورووپاوە بێدەنگ نابێت، باشە چ جۆرە سیستەم و دەسەڵاتێك دەبێتە دەسەڵاتی جیهانی لەم سەدەیەدا؟

دەزانین ژمارەیەکی زۆر لە کۆمپانیاو دامەزراو و دەزگە جیاجیاکان لە سەرەپای جیهاندا دەسەڵاتی ئابووریو زانیارییان هەیە بە یەك شت لە وڵاتانی تر جیان ئەویش هێزی سەربازییە، ئەوانە هەوڵی دەسەڵات دەدەن، ئەگەر هێزی دەوڵەتێك یان چەند وڵاتێك نەیاتوانی ئاسایش و ئارامی بپارێزێ ئەوکاتە کۆمپانیا هەمەرەگەزەکان ناچار دەبن که میلیشیاتی تایبەت بە خۆیان دروستبکەن، چونکە وڵاتان بەرامبەر کاری تیرۆریستی داماون سەرباری ئەو هێزە سەربازییەی هەیانە، لەبەر ئەوە ئەو لایەنانە پاسەوان و چەکداری تایبەتی خۆیان دەبێت بۆ بەرگریو پاراستنیان ئەگەر ئەو بارە چارەسەر نەکرێت.

بۆ چارەسەری ئەو نالەبارییە پێویستە رێکخراوو دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان وەك UN لە هەوڵی دانانی یاسایەکی نێودەوڵەتی نوێدا بێت بۆ جێبەجێکردن و چەسپاندنی ئەو یاسایانە کە ئەمڕۆ هەنگاوی باش و گەورەیان بۆ نراوەو ئاسۆیان روونە.

پێویستە گونجاندن لە نێوان ولآتان و کۆمپانیاو دامەزراوە جیاوازەکاندا هەبێت ئەو بویەرە ئەوە دەخوازێت کە UN مافی بەشداربوون بدات بەو دامەزراوو کۆمپانیاو ئەو گەلانەی کە بێ کیانی سیاسیو و دەوڵەتن، یان کۆمەڵەو گروپی ئایینیو رەگەزییەکان، کە بناغەی ئەو ریکخراوە نێودەوڵەتییە زیاتر بەهێز دەکات و ئاسایش و ئارامی زیاترو باشتر دەپارێزێت.

ئەو رێکخراوە پێویستە لە رێکخراوێکی نێودەوڵەتییەوە ببێ بە ریکخراوێکی نێونەتەوەیی جیهانی، گریمان دەوڵەتانی ئەندامی UN رێگەیان بەو بەرفراوانبوونە نەدا لەو حاڵەتەدا رێکخراوو دامەزراوی دیکەی دژ بە UN لە پاشەڕۆژدا دروست دەبێت، کۆمپانیاو گەلانی بێ دەوڵەت و کۆمەڵە ئایینیو رەگەزیەکان زیاتر بەهێز دەبن ئەو گریمانەیە راست بێت یان نا ئەوە لە پاشەڕۆژدا پێویستە ئەو لایەنانە بەشێکیان بەشدار بن لە رێکخراوی UN و دەسەتەکانیدا. چونکە سیستەمی نوێی جیهان و جیهانگەرایی لە کۆمەڵگەی شارستانیدا پێدەگاو هەڵدەکشێ نەك لە چوارچێوەی دەسەڵاتی رامیاری دەوڵەتدا چونکە کۆمەڵی مرۆڤایەتی خاوەنی بەهایەکی یەکسان و هاوبەشن، ناکرێ بە بەهای لابەلا لاکەی دیکە بشاردرێتەوە یان سەرکوت بکرێت جیهانگەرایی مانای گواستنەوەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە لە بازنەی توندوتیژیو دانپێدانانی بەرامبەردا بۆ بازنەی هاوکاریو لێکگەیشتن، کە بەرهەمەکەی کەش وهەوای ئاشتیو ئارامی کۆمەڵایەتییە لە جیهاندا، ئەوە دابەشبوونی دەسەڵاتە لە ستوونی لووتکەییەوە بۆ دەسەڵاتی ئاسۆییو بەشداری هەمەلایەنە.

## سەرچاوەکان:


***١-تحول السلطة، الفن توفلر***

***٢-المعنى والقوة في النظام العالمي الجديد، زكي العابدي***

***٣-تاريخ الفكر السياسي، جان نوشار***

***٤-مجلة الطريق، الاعداد (١،٣،٤)***

***٥-النهج، الاعداد (١٦،١٧،١٨)***

***٦-الانظمة السياسية المعاصرة، د. يحيى الجمل***

# بۆ بیری خۆكوژی مێژوو

□ نەجات حەمید ئەحمەد

گەوهەری بیری خۆكوژی بەرهەمهێنانی مردن و سەپاندنی ئەو مردنەیە بەسەر كۆمەڵگەیەك كە دەكرێتە لایەك لە كێشەیەك یاخود خستنە كێشەی لایەنێكی دیكە، هەموو كاتێ لەو كێشەیەدا پاساوی (سیاسی، مێژوویی، رەوشتی، جوگرافی) دەبنە هۆكاری بناغەی جۆشدانی چالاكییەكانی ئەو بیرە كە لە زۆربەی كاتەكاندا لایەنێك بە فراوانی هەموو هێماكانی ئەو هۆكارانە لە مرۆڤدا زیندوو دەكاتەوەو بە ناوی ئەو هێمایانەوە چەندین كارەسات دەخاتە كۆمەڵگەكانەوە، بەمەش تەنیا مانایەكی سەرەكی دەبێتە ناوەرۆكی ئەو بیرە خۆكوژییە، هەروەكو چۆن زۆرداران دەتوانن گوتارێك بۆ چالاكییەكانیان ئامادە بكەن هەروەها گوتارێكی بیری خۆكوژی دیكەش دەسەپێننە سەر لایەنی دووەمی بە كێشەكراوەكە هەروەكو چۆن دەشێ بیری خۆكوژی لە چالاكییەكانی (بەرهەڵستی، شۆڕش، راپەڕین و بزوتنەوە، توندوتیژی، یاخیبوون) بە جوانترین و رازاوەترین ماناكانی نەتەوەیی‌و نیشتمانی‌و قوربانیدان و راستی‌و ماف و دادپەروەری‌و یەكسانی‌و خۆشگوزەرانی مرۆڤ ئاڵ و واڵا بكرێ‌و پەسنێك لە پەسنەكانی چالاكییەكانی سەرەوە بە خۆی رەوا ببینێ‌و هەوڵێك یا پرۆژەیەك بۆ گۆڕانكاری مانا مێژووییە چەسپاوەكان بخاتە بیرەوە.

بە هەمان شێوە بە چالاكبوونی بیری خۆكوژی لە لای زۆرداراندا دەشێ بە پیرۆزترین و جوانترین ماناكانی سەروەری مێژوویی‌و نیشتمانی‌و نەتەوەیی ئاسایشە جۆربەجۆرەكان بڕازێنێتەوە، گەر بێتو تاكە سنوورێك لە نێوان زۆرداران و زوڵملێكراوان لە بیری خۆكوژیدا هەبێ زۆرداران نە راستی‌و نە مافەكانی مرۆڤ ناكەنە پێوانە بۆ پراكتیك كردنی دەسەڵاتە جۆربەجۆرەكانیان هەروەها زوڵملێكراوانیش كەوتنە بازنەی بەرپەرچدانەوەی چالاكی بیری خۆكوژییەوەو چوونە ریزی ئەو بیرەوە هەمان گوتاری سنووردار بەرهەم دێنن و دەشێ وەك بیرێكی بەرپەرچدەرەوەی خۆكوژی پراكتێكی هەمان زۆردارییەكان بكەن، لە راستیدا جیهانی كلاسیكی بە روونی واتاكانی خۆی جێهێشت ئەمڕۆكە راستی‌و دادپەروەری دەشێ بكرێتە دروشمی پڕ لە ئاڵ و واڵای زۆرداران لەو كاتەی هەمان ئەو دروشمانە بە شێوەیەكی سروشتی لە لایەن زوڵملێكراوان بەرزدەكرێنەوە تەنیا ئەو گروپ

وئایدیۆلۆژییە نادیسپلینانە نەبێت کە پڕ بە پێستی رستەی مردن لە پێناوی مردن چالاکییەکانیان ئاراستەی کۆمەڵگەکان بکەن هەرچۆنێك بێت بیری خۆکوژی نمایشی مردنێك دەکات کە مرۆڤ بەرەو ساتە هەرە سەرەتاییەکانی رەمەکیبوون دەبات و لەناوبردن و پێشێلکردنی ژیربێژی ئاوەزو بەرجەستەی گیانی توندوتیژیو لەناوبردن دەکەن، کۆمەڵانێکی زۆر بەبێ ویستی خۆیان و بە ناچاری کەوتنە ژێر دەواری بیری خۆکوژی دەستە دیسپلینکراوەکانی دەسەڵات و دامو دەزگە سەرکوتکەرەکان و کۆمەڵانێکی زۆر بیری خۆکوژییان وەك جێگرەوەی هەموو شێوازێکی شارستانی کردە باوەڕێك بۆ ژیان، دەڵێن زەوی بەشی هەموو خەڵکی دەکات و دەڵێن گەر مرۆڤ دادپەروەر بێ کۆتایی بە زۆرداری دێ، بەڵام مێژووی دوێنێو ئەمڕۆ بە هەموو شێوازێکی کارتێکردنە سەر عەسکەرتارییەت، جەنگی ئابووری، جەنگی دیپلۆماسیو راگەیاندن لاسایی بیری خۆکوژی کلاسیکی دەکەنەوە کە بیرێکی رەمەکیو لە هەمان کاتدا سیمایەکی گەوهەری مرۆڤە لە بەخشینی هەموو شەرعییەتەکان بۆ نمایشکردنی دەسەڵاتی خۆی.

لەم پێشەکییە روونکەرەوەیە دەچینە ناواخنی بابەتەکەوە، مرۆڤ هەمیشە واتا بەکردارەکانی خۆی دەدات دڕەندەترین و نامرۆڤانەترین جەنگی زۆرداری هەمیشە لە گوتاری خۆیدا باوەڕێکی بە پیرۆزکراو دەکاتە میکانیزمی بردنە سەری چالاکیو کردارەکانی گوتاری زۆرداران هەمیشە گوتارێکە بناغەکەی لەسەر یاسایەکی بە شەرعییەتکراو دادەڕێژێ چالاکی بیری خۆکوژی سەرەتاکەی لە زۆردارانەوە دەستپێدەکات و دواییش زۆرلێکراوان دەخەنە دووتوێیەوە مرۆڤ پێش ئەوەی بچێتە سەر هەر بیرێکی دیاریکراو لە سەرەتادا تیۆریزەیەکی ناخەکی بۆ دەکات پۆلێنکردنە رەوشتمەندییەکانی چاکەو خراپە ئەم راستییانە ناگۆڕن خواستی شەڕخوازی لە لای مرۆڤ هەروەك خواستی چاکەخوازی کاردەکەنە سەر مێژوو بە قەد یەکیش رێکەوتی بەکردارکردنیان لەبەر دەم دایە زۆر لە زۆردارانی جیهان ئەوانەی کۆمەڵەکانیان بە رووی مردن کردۆتەوە رێکەوتێکی زۆری ئاشتیو چاکەخوازییان لەبەردەمدا بووە کە بۆیان هەبووە ئاراستەی مێژوو بە لایەکی دیکەدا بەرن کەواتە دەشێ پرسیاری ئەوە بکەین چۆن دەتوانین هەر پەسنێکی چاکەخوازی یاخود مەیلی شەڕخوازی بە بویەرێکی مێژوویی مرۆڤ دابنێین لەو کاتەی لە ٢٠٠٠ ساڵی رابردوودا مرۆڤ لە لایەن پەروەردەی ئاوەزو رەوشتەوە نەیتوانیوە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی دادپەوەرانەو دروستانە بە راستی بکاتە هۆیەك بۆ نەهێشتنی خواستی شەڕخوازیو دوژمنداری لە نێوان مرۆڤی سەر ئەم زەمینە لە راستیدا هەموو رێساو یاساکانی پەرەسەندنی شارستانییەت لەسەر گریمانی نەمریو زیندوویەتی خواستی دوژمندارێتیو شەڕخوازی رۆنراوە، ئایدیۆلۆژییەکان، ئایینەکان، سیستەمە سیاسیو کەلتورییەکان هەموو لەسەر دابەشبوونی ئاوەزی مرۆڤ پەرەدەسێنن و هەردوو خواستی دژ بە یەکی مرۆڤ بوونێکی تەواو و پڕاوپڕیان هەیە لە پەرەسەندندا ئەمەش بەرجەستەیەکی نمایشکارانەو پراکتیککارانەی هەردوو خواستی مرۆڤە لە ژیانێکدا کە

جڵەوی لە دەست مرۆڤ دەرچووە ئاوەزی زۆرداری لە کەلتووری کۆن و نوێدا هەر زیندووە هەروەك چیرۆکی بەرخ و گورگی لافۆنتین وایە لەو کاتەی بەرخەکە هەموو ژیربێژیو راستییەکان بۆ گورگ دێنێتەوە، بەلام هیچ سوودی نییەو ژیربێژی دابەشبوون و دووسەری دەسەلاتی سروشت لە هەموو ژیربێژییەکان گەورەترە ئەمەش هەروەك پەندی کوردی کە زۆر هات قەواڵە بەتاڵە وایە کە دەربڕین لە ئیفلاسبوون و بێهودەیی ژیربێژی ئاوەز دادپەروەری دەکات لەبەردەم خواستی شەڕخوازیو دوژمنداریتی ئەم کەلتوورەی دەربڕین لە واتایەك دەکات کە لە ناخی مرۆڤدا جێگیرە لە مێژوودا بە شێوەی جیاجیا خۆی خستۆتە نێو کارەساتەکانی مرۆڤەوەو ئەمڕۆکەش هاوسۆزیو مامەڵەکردنێکی پان وپۆڕی لە ئاوەزی مرۆڤدا هەیە لەو کاتەی دابەشبوونی مرۆڤی سەر زەمین لە نێوانی هەرە پەرەسەندوو ودواکەوتوودا تەنیا بەردەوامییەکە بۆ ئاوەزی دووسەریی مرۆڤ ئەوەی وامان لێدەکات لە خۆمان بپرسین ئاخۆ بە راستی مرۆڤ خواستی سەرخستنی چاکەخوازیو دادپەروەری هەیەو دەیەوێ خواستەکانی دابەشبوون ودژایەتیکردن وشەڕخوازییەکانی رەتکاتەوە لە ناخی هەموو مرۆڤێکدا خواستی چاکەخوازی هاوسۆزییەکی لەگەڵ خواستی شەڕخوازیدا هەیەو دەتوانێ لە ساتێکی هەرە گەیوو دەگمەندا پاساوی تەواو بۆ خواستی شەڕخوازی بدۆزێتەوە لەو کاتەی دکتاتۆرییەتێکی یەکسەرانە لە خواستێك لە خواستەکاندا بەرجەستە دەکات بە ناوی دادپەروەری کۆمەلایەتیو یەکسانیو سەربەستیو یەك چارەنووسی مرۆڤەوە ولاتانی دنیا بە شێوەی جۆراوجۆر کارەساتی دەگمەنیان بەسەر مرۆڤ داهێناوە بە ناوی ئاشتیخوازیو ئازادییەوە مرۆڤ چەندین کوشتاری خوێناوی بەسەر مرۆڤدا هێناوە لە ناخی هەمور مرڤێکدا شکستی خواستی چاکەخوازی زیندووەو واتاکانی تێکەڵ بە خواستی شەڕخوازی دەکات زۆر لە دەوڵەت و شارستانیەتەکان لەسەر خواستی شەڕخوازیو نمایشکردنی خواستی دژایەتیکردندا دامەزران ئەم سیمایانەی پێکهاتی ئاوەزی مرۆڤ ئەو بوونە شاراوەو دووسەرانەن کە تاکو ئەمڕۆ مرۆڤ کاریان پێدەکاو لێیان دەرباز نەبووە هێزی شەڕ هەمیشە لە پشتەوەی هێزی ئاشتی دایە هێزی ئاشتی هەمیشە کەرەستەیەکی هێزی شەڕە بۆ سەودایکردن هێزی شەڕخوازی هەمیشبە لە بویەری سەر زەویو ژیربێژی بە دەسەلاتتر بەهێزتر دەرناچێو هێزی چاکەخوازیش هەمیشە لە بێهودەیی کەشەکانی قوربانیدان و رازیبوونی ناچاریو داسەپاندنی کۆتایی هەموو کێشەکانی جیهان دەژی ئەمەیە شکستی مێژوویی مرۆڤایەتی لە هەر بانگەشەیەکی گیانیو ئاوەزیدا.

ئەوەی لە پشتەوەی هەموو کردارە شەڕخوازیو ئاشتیخوازەکانی مرۆڤەوەیە ئەو گرو تینە سازدەرەی بیرە کە مرۆڤ بەرو خۆکوژی دەبات کە مرۆڤ بەرامبەر بە مرۆڤ دەخاتە کێشەوە ئەوەی دوێنێ لەسەرەتای مێژوودا قابیل و هابیلی خستە جەنگەوە، سوکراتی بە مردن رازی کرد مەسیحی بزمار بەندکرد، گالیلۆ وکۆپەرنیکۆس و سەدان کەسی بەرەو رووی مردن کردەوە لەگەڵ جیاوازی شێوەکانی رووداودا هەمان ئاوەزی سەرەتاییە کە بە

کەرەستەی نوێو ئامێری نوێوە گەورەترین رووداوی جینۆسایدیان سەپاندە سەر مرۆڤەوە لەدوا ساڵەکانی هەزارەی دووەمدا بیری خۆ کوژی خۆی دەخاتە نێو کرداری دەستە ئایدۆلۆژیو دەوڵەتان و یاساکان و تیۆرەکانی عەقڵەوە لە ترۆپکی ساتە شەڕخوازییەکانی مرۆڤدا جێگیرەو لە قووڵاییە هەرە بزرەکانی بیرکردنەوەی چاکە خوازیو گوتاری ئاشتی خوازەکانی مرۆڤدا ساتی گەشانەوەی خۆی هەیە سەیر نییە ئەگەر زۆردارانێك رۆژێك لەرۆژان بانگەوازی ئاشتیو دادپەروەرییان کردبێو کارەساتە گەورەکانیان بەهەمان بانگەواز لەقاوغ گرتبێت بیری خۆ کوژی ئاوەندێکە بۆ بەرهەمهێنانی توندو تیژی لە ژێر هەر پاساوێکی دیاریکراودا، لابردنی حوکمی لەسێدارەدان لەسەر تاوانباران لە زۆر دەوڵەتانی جیهاندا دان پێدانانێکی ناڕەستەوخۆیە بۆ واقیعی دەروونیو مێژووی مرۆڤ لە خواستە جیاوازەکانی لەهەمان کاتدا هاوسۆزییەکی راستەقینەی مرۆڤە لەگەڵ مرۆڤدا بەهەموو شێوازەکانی بیرکردنەوەو رەفتارە جیاوازیەکانیەوە. یەکێك لە ئامارە بۆکردنە نوێیەکانی تیۆری بنیات گەری دەروونی دینامیکی دەربارەی ئەو خواستانەی مرۆڤ لەوێوە سەرچاوە دەگرێ کە مرۆڤ ئەو کاتەی لە خواستە چاکە خوازو ئاشتی خوازەکانی نشوستی دێنێ لە پەیوەندی بەوانی دیکەوە، ئەوسا بەرەو مەیل و خواستە شەڕانگێزەکانی دەچێت. بەڵام دەبێ سەرنەکەوتن و نوشستی لە بنیاتنانی مەیلی شەڕخوازی پەنا بۆ مەیلی ئاشتی خوازی بەرێت؟!! چ پێوانەو چ بەهایەکی مرۆڤایەتیو ئاینیو یاسایی دەتوانێ هەموو شەرعیەتێك بەسەرکەوتنی تاقە مەیلێك بدات و سنورێك لەنێوان ئەم دوو مەیلەدا بنێت و مێژوویێکی بەردەوامبوونی پێببەخشێت؟! گەورەترین نوشستی مرۆڤ لە چەسپاندنی مەیلی ئاشتی خوازی لەجیهانداو گەورەترین کەلەبەری هەموو کردارە زانستیو ئاشکراکانی مرۆڤ لەپراکتیکی دەسەڵاتە جیاوازەکانیدا دەبنە ئەو هۆکارانەی ئاوەندێك بۆ دژە خواست چێبکەن ئێمە لەسەردەمی مردنی ژیاندا دەژین و زمان بەرجەستەی پێکهاتە دەروونییەکانی مرۆڤ ناکات.

زمان بۆتە هۆکارێکی بە رووکەشکردنی واتا، ئەو واتایانەی گوزارەیەکن بۆ پەردەپۆشکردنی راستییەکان، هەر ئەم راستیەش وامان لێدەکات گومانێکی دیکە بخەینە سەر سروشتی لەقاوغگیراوی ئەو هاوکێشە ناسەنگانەی پۆلینی دووسەرەیی دەروونی مرۆڤ دەکەن، مرۆڤ لە ناخەوە ناتوانێ بەتەواوی نمایشی لایەنگیرییەکی تەواو بکات بۆ مەیلە ئاشتیخوازەکانی، هەر ئەمەش وا لە مرۆڤ دەکات، نەك بەپێی نوشستی خۆی لە دروستکردنی پەیوەندییە ئاشتیخوازەکانی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا لایەنگری بۆ کردارەکانی یان سروشتێکی دیاریکراوی خۆی نیشان بدات، بەڵکو کۆمەڵێك چەمك و پێناسی دیکە کە هەموویان دەربڕین لە دەسەڵاتی خواستی مەیلی خۆکوژی مرۆڤ دەکات لە(بیری دوژمنداریەتیو رەمەکی بوون، سەرەتایەکی سروشت، دووسەریی بیرکردنەوە...هتد) شەرعیەتێکی ناڕاستەقینە بەهەموو خواستەکانی خۆی بدات خواستەکانی مرۆڤ لە خودەوە چەکەرەیەکی سروشتیو نا سروشتیش دەکەن و پاش کاملکردنی

کاریگەرییەکانی بەچالاکبوون بەرەو کرداری دەسکۆیی دەچن، ئەمەش وا دەکات، لە هەموو بەگروپکردنێکی دەسەڵاتدارانەی رامیاریو ئایدۆلۆژیو ئایینی کاریگەر بن بەچەمکی پاڵەوانیەتی تاکە کەسیو سروش و چەوسانەوەیەکی ئاوەزیانە ببینن هەر ئەم لایەنەشە دەوری کەسایەتی سیاسیو عەسکەریو ئایدۆلۆژییەکە دەردەخات لە دەستکۆیی کردن و گشتاندنی مەیلەکاندا ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی مرۆڤ لە لاوازترین وکۆمیدیترین باری نا دیسپلینی رێکخستن و لۆژیکدا بژێت. زۆربوونی یاساکان زۆربوونی رێککەوتنە نێودەوڵەتیەکان زۆربوونی رێکخراوە مرۆڤایەتیو رامیاریو ئایدۆلۆژیو رۆشنبیرییەکانی...هتد) چاکترین بەڵگەن نە تەنها بۆئەوەی مرۆڤ بەرەو شارستانیەت دەچێ، بەڵکو چالاکیە دژ بەیەکەکانی نێوان ئاشتیو شەڕ، روو لە زۆربوونەو ئەو مێژووەی دوێنی توندترین شێواز لەم رووەدا خۆی دەنوێنێ تاوەکو ئەمرۆش گۆڕینی رووی مێژوو لە خەونەوە نزیکە، هەربۆیە هەمان ئەو یاساو رێکەوتنە زۆرو زەبەندانە بناغەیان لەسەر دووسەریی بیری تاوان و سزا چاکەو خراپە شەڕو ئاشی دارێژراوە. لە راستیدا جیهانی ئەمڕۆ ئەمەندەی دژایەتی جەنگی جۆر بەجۆری کەلتووریو راگەیاندن و یاسایی خۆی بۆ سەرخستنی ئاشتیو دادپەروەریو یەکسانی بەکاردەخات، ئەوەندە دان بەبوونی خواستێکی دیکە نانێت، هەروەك ئەوەی ئێمە لە ترۆپکی شارستانیەتێکدا بژین کە هەموو بەرهەمەکانی ئاشتیو چاکەخوازی بێت، لەگەڵ ئەوەشدا تاوانەکانی مرۆڤ بەردەوام ناسنامەو شێوازەکانی خۆیان دەگۆڕن و گەورەترین زۆرداری جیهان گەورەترین یاساو بۆ خواستی شەڕخوازی دێنێتەوە. گەر لە گەورەترین دیکتاتۆر بپرسین بۆچی مەیلی شەڕخوازی توندوتیژی بەسەرتا زاڵە ئەوا بە ئاسانی دەتوانین بڵێین لەوکاتەوەی مەسیح لەخاچ درا چ مەیلێکی چاکە خوازیو ئاشتی خوازی لە جیهاندا توانیویەتی ئارامگەیەکی بێ خوێن و بێ کوشتار بۆ مرۆڤ دابمەزرێنێ؟؟؟

ئەمەش دەلالەت لە کەوتنێکی گەورەی مرۆڤ دەکات، هەروەها دەربڕین لە نایەکسانی ئەو مافانە دەکات کە هەر کۆمەڵگەیەك یا هەر نەتەوەیەك بۆخۆی بەرەوای دەبینی، هەروەها بەشێوەیکی نا راستەخۆتریش مانای ئەوەیە هەردوو خواستی مرۆڤ بەقەد یەك دەتوانن شەرعیەت بەخۆیان بدەن لەهەر پرۆژەیەکی دەسکۆیی دیاریکراودا، لەو باوەڕەی کە هیچ یەکێك لەداکۆکی کەرانی یەکێك لەو دوو مەیلە ناتوانن جیهانێکی نموونەیی بۆخۆیان بنیات بنێن یان مێژوویەك لە ژیانی تەبایی بێننە کایەوە. گەلانێکی زۆر لەجیهان لەنێوان دەسەڵاتدارێتی توندو تیژو جەنگ و شەرانگێزیدا دەوران دەور دەکەن. لەبەردەم ئەم واقیعە نەگۆڕو لەسەر خۆیەدا چ پرۆژەو جێگرەوەیەك لەئارادایە کە ببێتە دەرگەیەکی نوێ بۆ خوێندنەوەیەکی نوێی مرۆڤ و داهاتووی مرۆڤ؟!! لە راستیدا بیری خۆکوژی رەگێکی قووڵی لە ناماقووڵیو بێهودەییو دەستەپاچەیی مرۆڤدا لەو خەونانەی دەیەوێ بەدیان بێنێت کوشتاری جولەکە لەلایەن هتلەرەوە کوشتاری خەڵکی (پنۆم وپنە) لە لایەن (پۆل پۆت)ەوە کوشتاری برسیەتیو مردنی جوتیاران و کوشتاری چەندین قۆناغی

مێژوویدا، کەمیو نەبوونی سەرکەوتنی هەر پرۆژەیەکی ئاشتی خوازی جیهانی هیچ پاساوێکی نەمێژووییو نە کۆمەڵایەتیو نەرامیاریان نییە بەقەد گەورەییو خەون و بیرە خۆکوژیە خودیەکان هەمیشە مێژووی زێدەڕۆییو توندوتیژی زاڵە بەسەر هەر راستیەکی مێژوویدا ئەمەش پەیوەندی بەوەوە نییە ئاخۆ لەداهاتوودا مرۆڤ دەتوانێ گۆڕان بخاتە مێژووەکەیەوە یان نا بەڵکو پەیوەندی بەسروشتی مرۆڤایەتیەوە هەیە .

*ئەوی وا لەو کەسایەتیە دیاریکراوە دەسەڵاتدارانە دەکات خواستی شەر خوازیان تائەوپەری سەرەتایەتی بەرن ، لەوەدایە ئەوان لەکەشێکی دوژمنایەتی کردنی بیری* خۆکوژیدا دەژین بەومانایەی خواستی ئاشتی خوازی لەلایاندا بزرە ئەمەش پەیوەندی بەوەوە نییە ئەوان نووشستیان بەپەیوەندی دروستکردنی ئاشتی خوازیدا هێناوە، بەڵکو ئەوان هەمووجێگرەوەیەکی شیاو بۆنەهێشتنی ئەو بیرە رەتدەکەنەوە بەتایبەتی لەو کاتەی خواستی شەڕخوازی لەبیری نازیربێژی دانپێدانەنانی راستیدا دەچەسپێ کەهەموو داهێنانەکانی بیرو تیۆر، نەیان توانیوە لەو مێژووە دووردرێژو درندەو ئەموستەچاوە مرۆڤ رامگیرێ جیهانێك بکەن کەخواستی ئاشتیخوازی بلاَوبێت و لەسەرەوەی هەڵبژاردنەکانی دیکەدابێت .

یەکێك لەبازنە بزرەکانی میکانیزمی رۆچوونی مێژووی گەلی کورد نەبوونی خواستی شەڕخوازیە لەلای دا، بۆماوەی نزیکەی دووهەزار ساڵ، ئەمەش هۆیەکی سەرەکی مانەوەی کوردە لەبازنەی جوگرافییەکەی دوور لەهەر دەربازبوونێك لەبیری خۆکوژی دوژمنانی دوور زۆر دوور لەوخواستەی کەپێناسێك بۆکوردزوبان هەبێت لەجوگرافیاکەیدا ئەمەش رەنگدانەوەی کاریگەری گوتارە دووسەرە و جیاوازیەکانی گەلانی دەوروپشتی بووە لەخواستی خۆکوژیدا کە هەمیشە کوردیان وەك ناوەندێکی پراکتیکی بۆخواستەکانیان خستۆتەگەڕ هەمیشەش ئەو خواستانە لەدوو جەمسەری خواستی دوژمنداریەتیو هاوپەیمانیەتی خۆکوژیدا بووە لێرەوە مێژووی نزیکەی دووهەزار ساڵەی کورد لەنێو دۆزەخی ئاڵۆزیەکانی ئەو دووجەمسەرەدا لەچوار چێوەگیراوە هیچ دەسەڵاتێکی نمایشکەری بیری خۆکوژی نەیویستوە کورد لەو بازنەیە دەرچێ ئەمەش هێشتنەوەی نەتەوەیەك بووە لەپاشەکشەیەکی چەق بەستووی مێژوویی.

ئەگەر بێتوو هەموو کردارێکی بیری خۆکوژی هەڵگری ناسنامەیەك یان نموونەیەك لەباوەڕی دیاریکراودا بووبێت ئەوا بەدرێژایی ئەو مێژووە تاکو کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم هەموو هەوڵەکانی کورد هەر لە بازنەکانی وەرگرتنەوەی یا لاسایی کردنەوەی بیرە خۆکوژیەکانی دوژمنانی خۆی بووە، تەنانەت لەبەرامبەر بزربوونی هەر ناسنامەیەکی جوگرافیو ئاینیو ئایدیۆلۆژی، کەدەربڕین لەبوونی خۆی بکات ئەمەش بەدەوری خۆی دەربڕین لەگەورەیی ئەو گوشارانە دەکات کەبەسەر بوونی کوردەوە بوونە لەماوەی مێژوویی دووردرێژدا، هێدی هێدی بیری خۆکوژی ئاراستەکراوی سەر کورد توانی دواچۆڕ بەپرسیارەکانی کەسایەتی کوردا بسڕێتەوە پەیوەستەمێژووییەکانی کورد لەچەند

بازنەیەکی بزرو چەند پێناسێکی بزرەوەیە ، هەروەك گەڕاندنەوەی ئەو ناهاوسەنگیە مێژووییانەی دەربڕین لەدابڕانی کەسایەتی کورد دەکەن لەو شارستانیەتەی وەك نەتەوەیەك بناغەکانی داڕشتووە لەڕاستیدا ئەوەی لێرەدا بەلامانەوە گرنگە خوێندنەوەی پێداچوونەوەی مێژووی کورد نییە بەڵکو گومان خستنە سەر ئەو بەهایانەیە کەبۆماوەیەکی درێژ توانیان کورد بخەنە سەر شێوازێکی دیاریکراولە پڕکردنەوەو توانەوەی کەسایەتی لەهێماو بەها خواستراوەکان کە ئەمڕۆکە وادەکەن کورد لەدەرەوەی کەسایەتی خۆیی‌و جوگرافیاکەی بڕوانێتە دنیاو لەجیهانبینیەکدا بژێت کەجیهانبینی مرۆڤی خۆی نەبێت و پابەندی بیرو جوگرافیای دەرەوەی سنوورەکانی خۆی بکات. هەروەك چۆن مێژوویەکی توندو تیژ لە چەمکە داسەپاوەکان تاکو ئەمڕۆش باڵی بەسەر عەقڵیەتی رامیاری‌و رۆشنبیری کورددا گرتووە. هەروەك ئەوەی میکانیزمی هەڵسوڕێنەری ئەو مێژووە لە دەرەوەی هەموو خواستەکانمانەوە تەنها بەرەو بەرپەرچ دەرەوەی بەرەو روو بکەینەوە.

ژیان لە نێوانی مەترسی‌و چاوەڕوانی کردنی رەوینەوەی شالاوی هەڵگرتنی بیری خۆکوژی‌و هەوڵدان بۆ دەربازبوون لە توندوتیژی بیری خۆکوژی، ئەو مێژووە دوورو درێژەیە کە بە زەمەنی خەوبینین بە کۆتایی‌و بردنە سەری دۆزەخەکانی دەناسرێتەوە. هەموو کردارێکی ئەو مێژووە هەر لابردنی رەتکردنەوەی دڕندایەتیەکانی بیری خۆکوژی بووە. هەر لێرەدا رەگەزێکی گرنگی خۆ کوژی دەکەوێتە روو، بەرامبەر بەهێزی نمایشکەری خۆ کوژی لە جەنگ و کوشتاری کۆتایی پێ نەهاتوو، لایەنی دووەمی بەرپەرچ دەرەوەی ئەو بیرە دەکەوێتە روو. لەبەردەم مەترسی‌و شالاوی بەردەوامدا، لەبەردەم مەیلی خۆ سڕینەوەو خۆ رەتکردنەوەی بەردەوام، تاقە خواستێکی گەلی کورد تەنها ئەو ژیانە بووە هێزو دەسەلاتی هێرشبەر بۆیان خەملاندوە،هەروەکو چۆن سڕینەوەی هەموو خواستێکی لە دایکبوو، کە بۆی هەبێ هەمان مەترسی‌و رارایی بخاتە واتاکانی هێزی بەرامبەرەوە، ئەمە بووە روخساری بنەڕەتی ئەو مێژووەی کە سەرەتاکانی دەسەلاتی بیری خۆ کوژی‌و کاریگەریەکانی دەنوێنێ بەرەو کوردستان. ئەمەش ئەوە دەخاتە بیرەوە یەکێك لە هۆکارە هەرە سەرەکیەکانی نوشستیە مێژووییەکانی گەلی کورد توانای بەردەوامی نەدانی سەرتاسەریی بووەو لەهەر خواست و ئارەزوویەکی کە بگاتە ئاستی کیانێکی هەڕەشە لێکەری بیری خۆ کوژی داسەپێنراو لەلایەنی دوژمنەکانیەوە، هەروەها مانەوەی تەنها لەیەك گۆشەی کردارە نزیکەکانی بەرپەرچدانەوەی هێزی هێرش بەرە سەر کوردستان بخوێنێتەوە، دەبینین هیچ یەکێك لەو بەرپەرچدانەوانە لە ئەگەری(دەست بەرداری بوون، خۆ دانە دەستەوە، رێکەوتنی پڕ لە خزمەت و فێڵ و نایەکسان) بەدوور نەبووە، هەروەکو چۆن هیچ پرۆژەیەکی بەرپەرچدانەوەی کورد سەرتاسەری نەبووەو ئەمەش دەچێتەوە سەر چەند هۆکارێکی گرنگ کە لە سەرروویانەوە، پرۆژەو خەونەکانی کورد، زۆر سنووردارو بەرتەسك وناوچەیی بوونەو مل کەچی بوونی کورد لە

نیوەندێکی(گەورەو بچووك)ی سەرەك هۆزو میرو خاوەن زەوی‌و زارو فیۆداڵە سەرەتاییەکان، شوێنی هەموو رۆشنبیریەکی سیاسی و پەروەردەیەکی هۆشیاری مێژوویی گرتۆتەوەو هەموو خواستە بەرپەرچ دەرەوەکانی گرتۆتەوە. مانای سەرکردەی مێژوویی پڕ لە هۆشیاری‌و هەستیاری لەنێو لاپەڕەی رووداوو کارەساتەکانی کورد کەم و دەگمەن بوونە، ئەو سوپا سالارو میرو سەرکردەی خاوەن زەوی‌و زارانە، نەیانتوانیوە هیچ هەڵوێستێك و شێوازێك بەرپەرچدانەوەی زۆرداری ببەنە سەرو نەهیچ خواستێك جگە لە خواستی بەرپەرچدانەوەی ناکامڵ و ماوەکورت زیاتر بەرنە سەر،زۆر ئەو سەرکردانەی لەبەردەم توندو تیژی هێزی شاڵاو هێنەری بیری خۆ کوژیدا خۆیان داوەتە دەستەوە، هەڵگرتنەوەی دروشمی(یان کوردستان یان نەمان) لە مێژووی خەباتی هاوچەرخانەی گەلی کوردا، رەنگدانەوەیەکی کاریگەری مێژوویی دەنوێنێ‌و دواندنێکی مێژووی هەرە زۆرینەی بزووتنەوەی جەنگەکانی کورد بووە کە تیایدا کۆتایی هێنانی پێش وەختە بەهەر یەکێك لەو بزووتنەوانە خاسیەتێکی گەوهەریی ئەو مێژووە بووە.

هەر لەبەرەبەیانی مێژووی زانراو و نووسراوی کوردەوە نەبردنە سەری خواستە بەرپەرچدەرەوەکانی شەڕخوازی دژ بە کورد هەموو کاتێك دەستە باڵای بیری خۆ کوژی هێناوەتە سەر خاکەکەی، زۆرینەی جەنگە مێژووییەکانی کورد هەر لەسەر خاکەکەیدا بووەو لە خاکێکی دەرەوەی سنوورەکانیدا نەبووە. هەموو خەونەکانی کورد لە سنووری خاکەکەیدا بووە، گەر بێتوو بزانین هەموو نەتەوەیەکی خاوەن خواستی شەڕخوازی‌و پەل هاوێژ لە کۆتایی پاشەکشێ‌و نوشوستیەکانیدا لە خاکێکدا یاخود لەخاکەکەیدا گیرساوەتەوە ئەوا پاشەکشێ‌و نوشوستیەکانی کورد لەدەست دانی دەسەڵاتی بووە بەسەر خاکەکەیەوە گەر بێتوو هەموو نەتەوە شەرخوازەکانی ناوچەکە لەسەر خاك وپەلهاوێشتن لە جەنگ و شەڕی دەرەوەی سنوورەکانیاندا بووبێتن و گەیشتبێتە رێکەوتن لەگەڵ یەکتری، ئەوا کورد ئەگەرچی هاوبەشی ئەو مێژووەش بووبێ هەموو ئەو رێکەوتن و پەیماننامانە کوردیان بەپاشکۆ کردووە هەر ئەمەش وای کردووە ببێتە نوێنەرێکی یا نمایشکەرێکی هێزە شەڕخوازو هێرشهێنەرەکان لەخاکەکەیدا. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی دەسەڵاتی کورد لەخاکەکەیدا لەدەسەڵاتی دوژمنەکانیەوە بووبێ. ئەو وێستگە مێژووییانە زۆرن کە دەسەڵاتدارانی بەناوی دەسەڵاتی داگیرکەرەکانی کوردستانەوە کوردیان بەڕێوە بردووە. لە خوێندنەوەی ئەو مێژووە دەگەینە ئەو باوەڕەی کە هەر ئەو خەونە سنووردارو ئەو بێ خواستە شەڕخوازیەی کورد بووە کە لە مێژوویەکی زۆر دڕندەو توندوتیژی شەڕخوازانی دەوروپشتیدا وەك نەتەوەیەکی یەککگرتوو بەرەو رووی ئەو خواستەی داگیرکەرو شەڕخوازانە ببێتەوە لەوکاتەی لە زۆربەی میللەتانی‌دیکەی هۆکاری سروشتی مرۆیی لەبارتربووە بۆ مەیلی پەل هاویشتن و دەسەڵاتدارێتی کردن لەناوچەکەدا، ئەم دەرك بەخۆ نەکردن و پەرتبوونەی کورد لەمێژوودا رەنگدانەوەی پڕ لە مەترسیی دیکە لەخاکەکەی خۆشیدا نمایش بکات و لەناوەوەشدا لە پەراوێزی دەوڵەتەکانی دەورو پشتدا

بەش بەش بێ. بە چەندین کانتۆناتی دەسەڵاتی سەرەتایی‌و میرایەتی لە دژی یەک لەناوچەیەکی بەرتەسک و ناوچەییدا کوردستانیان پارچە پارچە کردووە، دەڵێن زۆریی قەڵا لە کوردستاندا هێمای پێشکەوتن و شارستانێتی کورد بووە، بەڵام زۆریی قەڵا لە شوێنە بەرزو لەسەر گردۆڵکەو شاخەکاندا هەروەها ئامارژە بە بچوکی خەونەکانی کورد دەدەن لە خاکەکەیدا .

دەڵێن چیاکان تاکە پاڵپشتی کورد بوونە لەمێژوودا، بەڵام چیاکان هەروەک ئەو سنوورە دابڕو ئەو دەستەبەهێزانە بوونە کەخەونەکانی کوردیان لەچوارچێوە گرتووەو نەیانهێشتووە لەسنوورەکانی خۆیان ئاودیوبن .

مێژووی کورد بەزنجیرەیەک لەڕووداوی بەرپەرچدانەوەی خواستە شەڕ خوازیەکانی نەتەوەکانی دەوروپشتی خۆی دادەنرێت لە پێناوی پاراستن و هێشتنەوەی خەونە بچووک و سنووردارەکەی خۆی ، لەمەش بترازێ بەرامبەر بەم نووچخواردن و پاشەکشێ مێژوویيە هەروەک دەبینین نەتەوە هەرە رەمەکیەکانی ئاسیای ناوەراست توانیان بەخواستی شەڕخوازیان لەخاکێکی نائاشنادا ئیمپراتۆریەت و ولاتان دامەزرێنن و کوردستان داگیر بکەن و سوود لەنەتەوەی کورد وەرگرن بۆهێنانەدی خەونەکانیان ئەم خواستە لەقاڵب گیراوەی کورد تاکو ئەمڕۆش مێژوویەکی زیندووە ، لەدەروون و جوگرافیای کورددا گاریگەریەکی بەهێزی هەیە لەدابەشبوونەکانی کورد. لەوکاتەی لەبێناگاییەکی مێژوویيانەو نەتەوەییيانە لەسەرەوەی هەموو هیواکانەوە ، کورد لاسایی دووبارەبوونەوەی ئەو مێژووە توندو تیژە دەکاتەوە، بەڵام رووی مێژوو چۆن دەگۆڕدرێت؟!

بۆدەرباز بوون لەم گوشارو هێزە پێشێلکارە مێژووییە کورد هەر دەبێ لەوخەونە سنووردارو لەچوارچێوەگیراوەی خۆی راتەکێنێ، هەر دەبێ بەرەو خەونێک بچێت کەتیایدا سنوورەکانی خەونە لەچوارچێوەگیراو و پڕ لەدابەشبوونەکانی تێبپەڕێنێ، پیلانی سەرەکی دوژمنانی کورد تەنها لەدووتۆی فریودانی ئەو گیانە باوەڕپێهێنەرەی کورد بووە کەهیچ مەیلێکی بەردەوام و سەرتاسەری تێدا نەبووە. کە هیچ خواستێکی یەکگرتووی بۆ داهاتوو تێدا نەبووەو هەمیشە ئەو روحە لەمەیلە ئاشتیخوازو هەڵکشان و داکشاندا رووپەڕێکی سپی بووە بۆ تۆمارکردنی‌و نووسینەوەی مێژووی خواستی خۆکوژی تەماعکارانەی گەلانی دەوروپشتی‌و بەوەشەوە نەوەستاون، بەڵکو تاکو سنووری داگیرکردن و بەکارهێنانی کورد لەپێناوی سەرخستنی پرۆژەکانیان سوودیان لە بزربوونی یەکێتی‌و زەقبوونەوەی دابەشبوونی کورد وەرگرتووە. هەر بۆیە لەگەڵ گۆڕانی(سوڵتان وئیمپراتۆرو پادشاو حوکم بەدەستانی) ناوچەکە کورد رەنگدانەوەی دابەشبوون و دژایەتیکردنی یەکتری‌و چاونوقاندن لە کارەساتی یەکتری‌و خزمەتکردنی دەسەڵاتەکان سیما هەرە دیارەکانی ئەو مێژووە بووە، هەر ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی هیچ بزووتنەوەیەکی یاخی بوون ودەرچوون لەم گوشارانە سەدایەکی نەبێت لەهەموو کوردستاندا.

له راستیدا له خوێندنەوەی ڕووداوو شیکردنەوەی ئەو مێژووەدا هەمیشە بەرەو ڕووی ئەو پرسیارە دەبینەوە بۆچی گەلی کورد دەرکی بەیەك بوونی خاك و نەتەوەی خۆی نەکردووە، بۆچی هیچ پرۆژەیەکی یەکخستنی خاك و مرۆڤی کورد نەیتوانیوە ببێتە واقیع و سەدایەکی سەرتاسەری هەبێ. وێنەی تراژیدی لێك ترازانی مرۆڤ و خاکی کورد مێژوویەکی کۆنی هەیەو هەموو ئەو مێژووەش دەلالەت لە بزربوونی یەك چارەنووسی دەکەن لەلای کورد، ڕێکەوتی دابەشبوونی کوردستان لە نێوان ڕژێمە پادشایەتیو ئیمپراتۆریەکان ڕێکەوتێکی(جوگرافیۆ سیاسی) دەگمەنە لەناوچەکەدا، ئەمەش وای کردووە دەسەلاتداریتی بە پاشکۆکراو لەژێر سێبەری ئەو دەسەلاتە گەمارۆدەرانە دوا ئامانجی دەسەلاتداریتی کورد بێت، هەروەکو چۆن ئەو دەولەتە بەهێزانەی لەگەلْ جیاوازی و ناکۆکیی نێوانیاندا ئامادەی هاوکاری کردنی یەکتر بوونە بۆ لەناوبردنی هەموو هەولێك کە دەرکی بەم وەستانە مێژوویە کردبێ ئامانجی سەرەکی دەسەلاتداریتیش تەنها هەر مانەوەیەکی مەرجدارو لەقاوغ گیراو بێت، بێگومان خەونەکانی کورد یا خواستەکانی کورد سنووردارتر دەکات، لەو کاتەی کورد چ لە ڕەگەزی شارستانێتی پەیوەست بە ئاین و کەلتوورو داهێنانی شێوازەکانی حوکم کردن و دەسەلاتداریتیدا خەونێکی یا خواستێکی لەوە گەورەتری بەداهاتووەوە نەبینیوە، کە لەسنووری ناوچەکەی خۆیدا دوور لە پرۆژە خۆکوژیەکانی نەتەوەکانی دی بە ئاشتی بژیێت تەنها یەك نەگرتنی زمانی کوردیو دابەشبوونی بەسەر دیالێکتەکاندا واقیعی دابەشبوونی کوردو یەکنەگرتنەوەی قوولترو تراژیدیتر کردۆتەوە، ئەمەش نیشانەیەکە بۆ بزربوونی خەونی دەسکۆیی لەلای کورد، پەندی(ئەگەر برا لەپشت برا بێت مەگەر قەزا لەلای خوابێت) کە دەلالەت لە پرۆژەیەکی یەکبوون و پەندی یەکبوون دەکات تەنها لە بازنەی خێزانێك یا خەلکی گوندێك یا هۆزێکدا بووە، ئەمەش دەربڕین لە خواستە بچووکەکانی بوونی کورد دەکات دەربڕین لەمەش دەکات کورد هەموو کاتێك وێنەیەکی بچووکی داهاتووی لە عەقلیەتیدا پاراستووە. هەر بۆیە لەبەردەم ئەم بچووکبوونەوەیەی خواستەکانیدا لەبەردەم ئەم دابەشبوونە شارستانیو مێژوویيو کەلتوورییەی خۆیدا دوژمنانی پڕخەون لە شەڕخوازیو خواستی خۆ کوژی بە ئاسانی لەژێر پەردەی چەندین داخوازیو بەلێن و پرۆژەی وەهمیدا کوردیان فریوداوەو لەبارێکی مێژوویی دیاریکراودا هێشتوویانەتەوە ئەمەش بەلگەیەکە بۆ دیاردەیەکی مێژوویی زۆر ترسناك کە کورد تیایدا ژیاوە وەك نەتەوەیەك کورد دەرگەکانی شارستانیەتیو خاك و مرۆڤی خۆی والآکردووە، بۆ سڕینەوەی ڕابردووی مێژوویی خۆییو ژیان لە تراژیدیترین دابڕانی یەك لەدوای یەك لە مێژوودا، پەند وەرنەگرتن لە لێکدانەوەو خوێندنەوەی مێژوو نووچخواردنی یان ملدادانی بۆ گۆڕینی ڕەگەزەکانی شارستانیەتی خۆی ڕەگەزی دەرەکی لە کەلتوورو ئاین و تەنانەت لە زمانەکەشیدا وایان کردووە هیچ بەیەکگەیشتنەوەیەکی مێژوویی لەهیچ قۆناغێکی ژیاری کورددا بەرجەستە نەبێت. کورد هەمیشە لە زنجیرەیەك لە هەوەشانەوەی بەردەوامی مێژوویی یەك لەدوای

بەکی خۆیدا ژیاوە ئەم لێکترازانە مێژووییە لەهەمان کاتدا کاریگەرییەکی گەورەی بەسەر دابەشبوونی زێدەڕۆو یەکنەگرتنەوەی کوردەوە هەبووە لەهیچ پرۆژەیەکی نوێدا کورد لەدەرەوەی مێژوودا نەبووە، کورد لەناوجەرگەی مێژوودا ژیاوە بەڵام ئەو ژیانەی نەبۆتە هۆی ئەمەی مێژوویەك بۆ نوشستیە مێژووییەکانی بنیاد بنێ، لەو کاتەی دروستکردنی مێژوویەکی نوێشی بۆ هەڵکەوتبێ هەر وەك لەسەرەتای دروستبوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو پێش ئەمەش لە کۆتایی حوکمی ئەمەویەکان و لەسەرتای حوکمی عەباسیو دوای ئەویش لەسەردەمی سەلاحەددین ئەو دابەش بوونە مێژووییو لێکترازانە مێژوویانەی مرۆڤی کورد لەگەڵ خاك و زمانەکەیدا و پەرت بوون و توانەوەی لەهێزی شارستایەتی بەرامبەرەکەیدا وایان کردووە بکەوێتە ژێر کاریگەری رەگەزەکانی شارستانیەتی گەلانی دیکەو ئەگەر کورد هەر خواستێکی خۆکوژی بنیاتنەرانەشی هەبووبێ لەو سەردەمانەدا سەرچاوەکەی بۆ بوونی خۆی نەگەڕاوەتەوە.

که ئەمەش بەرەو دیاردەیەکی باوکسالاری دەسەلات پەرستی دەرەکی بردووە کە دیاردەیەکی ترسناکتری لێکترازانی پەیوەستەکانی نێوان کوردو خاك و کەلتوورەکەی بووە هەروەها گواستنەوەیەکی تەواوی مەیلە شەڕخوازیو خۆکوژییەکانی نەتەوەکانی دیکە بووە بۆ ماڵی خۆی، سەدان جار کورد لەو مێژووەدا لە پەراوێزی دەسەلاتەکانی دەوروپشتیدا لە ئاسۆکانی باوەڕو قەناعەت و بڕوابوونی بە دوژمنانی خۆی هیواو خەونەکانی خۆی خستۆتە نێو پرۆژەکانی دوژمنانیەوە تاکو ئەو رادەیەی باوەڕێکی لەلادا دروستبووە کە ئەویش لەبەردەم هیچ نوێبوونەوەیەکی شارستانیەتیدا باوەڕی بەوە هەبێ دەبێ کۆمەکیو یارمەتی دوژمنانی خۆی ناگاتە گەیاندنە سەری هیچ یەکێك لەو خەونانە، چەندین جار بە پەیمان و سوێندو بەڵێن و رێکەوتنی یەك لەدوای یەك سەرکردەکانی کورد لەسێدارە دراون و دیل کراون و کورد ئاوارەو دەربەدەر کراون، هەر بۆیە هاوبەشی کورد لە رووداوو جەنگ و گۆڕانکارییەکانی ناوچەکەدا رێکەوتنی دوولای بەهێزو دەسەلاتدار نەبووە، بەڵکو رێککەوتنی پەراوێزیو گەورەییو بچووکی بووە هەر بۆیە لەسەرجەمی رێکەوتنە ناوچەییو جیهانیەکاندا کورد وەك نەوتەوەیەکی دەسەلاتدار مامەڵەی لەگەڵدا نەکراوە لەگەڵ پەرەسەندنی مێژوو سەرەتای سەدەی بیستەم هەڵوێستی دەوڵەتە تازەکانی ناوچەکەو دابەشکەرانی کوردستان هەمان مێژووی خواستی خۆکوژیان بەرامبەر کورد نواند، مێژوو هەموو پەندو حیکمەتەکانی دابەشبوونی کوردو تێڕوانینی وەك نەتەوەیەکی لێکترازاو، بەتوندی خستنە سیاسەتی حوکمڕانە تازەکانەوە لەڕاستیدا هەرچەندە دامەزراندنی دەوڵەتە نوێیەکانی ناوچەکە داخستنی لاپەڕەیەکی درێژخایەن بوو لەمێژوو، هێنانەکایەوەی سیستەمی رامیاری نوێ بوو بۆ ئەم دەوڵەتانە لەسەرەتای سەدەی رابردوودا، بەڵام خواستە خۆکوژیو پەلهاوێژەکانی ئەو دەوڵەتانە چوونەوە سەر هەمان عەقلیەتی رابردوو بوو بەڵکو لەگەڵ داهاتنی دەوڵەتە نوێیەکاندا چەمکی جەنگی سەرتاپاگیری بە دڕەندەترین شێواز دژ بەنەتەوەکانی ئەم ناوچەیە بەکارهێنران کە یەکێك

لەو نەتەوانەی زیاتر لە کورد بەرئەم جەنگە سەرتاپاگیریە کەوتن گەلی ئەرمەن بوو لە تورکیادا. لەگەڵ ئەوەشدا کورد بۆ یەکەمجار نمایشی هەستی نەتەوەیی خۆی کرد، بەڵام هەر وەك ئەو دەسەڵات و حوکمەتە نوێیانە کەوتە داوی سوود وەرنەگرتن لە پەندەکان و ماناکانی مێژوو، کورد هەمیشە لەو مێژووە هاوچەرخەیدا لەنێوانی هەڵگرتنی داب و دەستوورو پەیوەندییە کلاسیکیەکانی سەردەمی بەسەرچووی ئیمبراتۆری‌و پادشایەتی لەناوچەکەدا کەوتە ژێر کاریگەری‌و دەسەڵاتی ئەو هێزە نوێیانە کە لەپێشوو توندڕۆتر نەك هەوڵیان دەدا کورد وەك کەرستەیەك بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان بەکاربێنن بەڵکو هەوڵی لەناوبردنی تەواوی نەتەوەی کوردیان داوە، بیری نەتەوەیی شتێکی نوێبوو کە هەستی پێگیری نیشتمانی دووسەرەو توندو تیژتر کرد، هەر لەدوای سایکس بیکۆوە سالی ١٩١٦ خاکی کوردستان بەشبەشکراو وەك زیندووکردنەوەیەکی‌زۆر توندوتیژی ڕێکەوتنی سەفەویەکان و عوسمانیەکان لەدابەشکردنی کوردستان لەسەردەمی شا مورادی چوارەم، هەربۆیە بزوتنەوە رزگاری‌و سەربەخۆییەکانی کوردستان کەوتنە داوی مێژووی داشبەندی دەوڵەتە نوێیەکانەوە، کورد هاوکاری لەگەڵ بزوتنەوە رزگاریخوازە نەوتەوەییەکانی تورك کرد کورد بەرهەڵستی هێزەکانی بەریتانیای کرد لە عیراق و کوردستان، کورد هاوبەشی هەموو دامەزراوێکی رامیاریانەی ئەو دەوڵەتانەی کرد بۆ داخستنی لاپەڕەیەکی خوێناوی‌و هیوابوون بە سەربەخۆییەوە، بەڵام چەند هۆکارێکی رامیاریانەو نێو دەوڵەتیانە وایان کرد کورد لەم جیهانە نوێیە دڕەندەترین جەنگی بەرەو روو بکرێتەوە. ئەو بناغە سەرەکیەی ئەو دەوڵەتانەی لەسەردامەزران باوەڕی نەتەوەیی شۆڤینی‌و تاقە نەتەوەی باوك سالار بوو، کە ئامادەبوو نەتەوەی کورد بەتەواوەتی لەناو بەرێ لەپێناوی چەسپاندنی سنوورە نیشتمانی‌و نەتەوەییەکانیان هەروەها نزیکی ئەو دەوڵەتانە لەلایەنی چەسپاندنی رامیاری بەرژەوەنداری رۆژئاوا لەناوچەکەو چاوپۆشینیان لەو هەموو رووداوانەی بەسەر کوردو نەتەوەکانی دیکە هاتن، لە لایەنێکی دیکەی سیمای نوێی ئەو دەوڵەتانە سوود وەرگرتنیان بوو لە شێوازەکانی پەرتکردن و دابەشکردنەکانی کورد هەرچەندە ئەو دەوڵەتانە دەوڵەتی ئایدۆلۆژیبوون بەڵام لەبناغەوە بۆ رووبەڕووبوونەوەی هیوای نوێی کورد بەشێوەیەکی زیرەکانە سوودیان لەهاوسۆزی کورد وەردەگرت بەلایەنی ئاین و هاوبەشبوون لەمێژوودا، هەروەك چۆن یەککگرتنی ئەو دەوڵەتە نوێیانەو ڕێکەوتنیان لەسەر لەناوبردنی هەر بزوتنەوەو شۆڕشێکی کورد، لە راستیدا سەردەمی نوێ بۆ کورد سەردەمی پاشەکشەیەکی دیکە بوو کە لە هەموو ڕێککەوتنە نیودەوڵەتیەکاندا کورد بێ نوینەرو نمایندەی خۆی بووە، نەتوانینی کورد لەمێژووی کلاسیکیدا لەدامەزراندنی هەردەسەڵاتێکی رامیاری‌و هەر حوکمڕانی‌و هەر دەوڵەتێکدا هۆکارێکی سەرەکی دابەشکردنی کورد بوو لەنێوان دەوڵەتە نوێیەکانداو تەنانەت راپەڕین و شۆڕش و هەوڵەکانی کورد لەپێناوی سەربەخۆییدا بەبێ هاوکاری‌و پشتگیری لایەنەکانی یان هێزەکانی کورد بووە لەو دەوڵەتانەی ڕێگەیان لەهەر پرۆژەیەکی رامیاری‌و دەستکۆیی گەلی

کوردا دەگرت، لەو کاتەی راپەرینەکانی کورد دەستیان پێکرد لەوکاتەی شۆڕشەکانی کورد دەستیان پێکرد هەر لایەك بەجیا لە پارچەکەی تر بەرەو رووی هێزی خۆکوژی دوژمنانی دەبۆوە تاقە هەستیاریەکی پاڵپشتی نەتەوەیی لەم مێژووە نوێیەدا ئامادەبوون و پاڵپشتی بارزانی بوو لە کۆماری مەهابادو دەوری لە دامەزراندنی ئەو کۆمارەدا، هەروەکو چۆن شۆڕشی شێخ مەحموود ئەگەری سەرکەوتنی گەورە تربوو گەر بێت و سمکۆی شکاك پاڵپشتی ئەم شۆڕشەی بکردایە دیارترین سیمای نوێی مێژووی کورد هەڵگرتنەوەی خواستی خۆکوژی بنیاتنانی بنیاتنەرانە بوو هەرچەندە ئەو خواستە بەلایەنی مێژوویەکی دوورودرێژەوە زۆر دواکەوتوو بوو دواکەوتنی مێژووییانەی دەربڕین لەخۆکردن و پێکەوەنانی ناسنامەی کورد کارێکی سەخت و قورس بوو لە جوگرافیایەکی دابەشکراو لە مرۆڤێکی دابەشکراو لە عەقلی دابەشکراودا، یاساکان و داب و دەستوورەکان و باوەڕەکان و ترسەکان و چەکوش و شمشێرە ئامادەکان و دڕندایەتیەکان بەهەموو قورساییەکەوە چاودێری هەر بزوتنەوەو خەونێکی نوێی کوردیان دەکرد، سیاسەتەکان رەنگاوڕەنگ و نامرۆڤایەتیتر بوون کەرەستەکانی جەنگ کاریگەرتبوون، بەرژەوەندییەکان و دەستێوەردانەکانی رۆژئاوا لە زەرەری کوردو لەبەرژەوەندی ئەو دەوڵەتە نوێیانە زۆرتر بوون بلۆك بەندی هاوپەیمانێتی عەسکەری‌و ئابووری‌و رامیاریان لەگەڵیاندا فراوانتر بوون کە لەهەندێك قۆناغدا دەوڵەتە سۆسیالیستەکانیشی دەگرتەوە مەسەلەی کوردو مافە رامیاری‌و مرۆڤایەتیەکانی رۆژبەرۆژ زیاتر گەمارۆ دەدران بەرامبەر بەم لەبیرکردنە جیهانیەی کێشەی کوردو کوردستان لە هەموو پارچەکانیدا شۆڕشی جیاواز هەڵگیرساندوە، بەڵام گواستنەوەی نوێی شوێنی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان دەوری خۆی هەبوو لەنووشوستی سەرتاپای ئەو شۆڕشانە ئەم قۆناغەی مێژووی کورد دەکەوێتە نێوانی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم و پێش کۆتایی سەدەی بیستەم بەچەند گرێ سەدەیەك واتە تاکو پارچەپارچەبوونی یەکێتی سۆڤیەتی کۆن لێرەدا پرسیاری ئەوە دێتە پێشەوە ئاخۆ ئەو مانا مێژوویانە چین کە لەمرۆکەدا بە زیندوێتی دەربڕین لە هێزی نمایشکەری بیری خۆکوژی داگیرکەرانی کوردستان دەکەن و دەیانەوێ کورد لەهەمان چەقبەستنی مێژووییدا بمێنێتەوە؟؟ ئاخۆ چ پرۆژەیەکی رامیاری‌و رۆشنبیری بۆی هەیە گۆڕان بخاتە بونیادە چەقبەستووەکانی مێژوویەوە؟!!

ئەگەر بێت و روویەکی خوێندنەوەی مێژوو شیکرنەوەی هۆکارە گەوهەرییەکانی بزوێنەری رووداوەکان بێ ئەك خوێندنەوەی رووداوەکان ئەگەر بێتو مێژوو مانایەکی راستەقینەی هۆکارو شێوازی چالاکیە جۆربەجۆرەکانی مرۆڤ بێت. دوور لەو پۆلێن کردنانەی بە کەسایەتی‌و قۆناغ و ساڵەکانەوە پەیوەست دەکرێن دوور لەو هاوسۆزیە بەتاڵ و سەلەفیانەی بۆ مێژوو دەرکەوێ دەبێ لەکۆتایی هاتنی سێ بارگەی مێژوویی‌و کورد بە جورئەتێکی گەورەترەوە پەندە بنیاتنەرەکانی ئەو مێژووە بە هەموو شکست و سەرکەوتنەکانیەوە لەمرۆکەیە بدۆزینەوە لەپێناوی روونکردنەوەی ئەو پەیوەندیەی ئێمەی

کورد بەدوێنێ دەبەستێتەوە، تاکو بتوانین لەوە بگەین چۆن بەداهاتووەوە دەبەسترێینەوە.
لە زۆربەی هەرەزۆری خویندنەوەکانی مێژووی کورددا خوێندنەوەکان تەنها بۆ پێناسکردنی کەسایەتی‌و رووداوەکان بوونە ئەمەش لایەنێکی گرنگی لە زانستی مێژوو خستۆتە دواوە کە ئەویش میتۆدی نوێی شیکردنەوەی مێژووە، هۆکاری سەرەکی ئەم پێدا هەڵگەرانەی مێژووش بزربوون و قەدەغەکردنی خوێندنەوەی مێژووی کورد بووە بۆ ماوەیەکی زۆر دوورو درێژ ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە دۆزینەوەی پەیوەستە مێژووییەکانی دوێنێیە بەمڕۆکەوە، وەك دانپێدانانێك بە دەستێوردانی رۆژئاوا لە ناوچەکەدا کورد بۆ یەکەم جار لە مێژووەکەی دا لە پارچەیەکی بچووکی کوردستانی گەورە ناوچەیەکی پارێزراوی بۆ دابین دەکرێ لە پرۆسەیەکی مرۆڤایەتیدا، کە بەناوی(دابینکردنی حەسانەوە)یەو نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەمریکاو بەریتانیاو هەندێك وڵاتانی‌دیکە رۆڵی سەرەکیان هەبووە لە راگرتنی نەك تەنها بیرە خۆکوژیەکانی عیراق بەسەر کوردەوە بەڵکو راگرتنی بارودۆخی کوردستان لە هەموو جۆرە پەیوەست و کێشەیەکی مێژوویی بەڵام ئەم پاراستنەی کورد هەر ناوێکی لێبنێین رێی لەوە نەگرتووە کورد حکومەتی ناوخۆی خۆی دامەزرێنێ‌و خۆی بباتە رێوە، هەروەکو چۆن بەهۆی جیهانگەرایی‌و بیری ئازادو راگەیاندن و تێکەڵی‌و پێککەیشتنەوەی دەڵێن جیهان بۆتە گوندێکی بچووك هەر بۆیە مەیلی شەرخوازی خۆکوژی سەرکوردیش گۆڕانی بەسەرداهات ئەمڕۆکە جەنگی سەرتاپاگیری نەك لە کوردستان بەڵکو لەجیهانیشدا بۆتە مەسەلەیەکی قورس و گران و بەزۆر لەسەر دەوڵەتان دەکەوێ باری ئازادی کوردستان لە لایەکەوەو پەرەسەندنی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان لەلایەکی‌ترەوە هەموو بە قازانجی کورد دەکەوێتەوە، کورد لەنێوانی بە دەوڵەتبوون وسەربەخۆیی‌و هاوبەشی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستاندایەو گۆڕانکارییەکانی رامیاری نێودەوڵەتی لە قازانجی کورد دایە.
بەڵام لەگەڵ ئەم ئاماژە مێژووییە پێش بەرانەی مەسەلەی کوردیشدا دەبێ لە هۆشیاری کامڵی مێژوویی خۆماندا بژین و بەسەر زۆر لەو وێستگە کارەساتاویانەدا زاڵبین کە هەمیشە کورد بەرەو پاشەکشێکردن دەبەن ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە تاکو ئەمڕۆ لە رۆشنبیری‌و رامیاری کورددا پەیوەست بەو مێژووەوە کۆمەڵێك دیاردەی رابردووە، تاکو ئەمڕۆکەش داکۆکی لە چەقبەستنی خۆیان دەکەن لەو کاتەی کورد لە جەنگی لەناوبردنی بەکۆمەڵ و ئاوارەکردن و بێ‌سەرو شوێنکردندا لەم بارە دیاریکراوو لەقاوغگیراوەی‌دا بۆتە شوێنی مەترسیەکی گەورە بۆ ئەو دەوڵەتانەو ئەوانیش لە رامیاری ئەمڕۆکەیاندا یەکێتی خاك و ئاسایشی وڵاتەکانیان گەورەترین گیرو گرفتن لەبەردەم بەردەوامبوونیان لە داگیرکردنی کوردستاندا ئەگەر بێتوو لە رابردوودا کورد هەمیشە بەرپەرچی رامیاری خۆ کوژی دوژمنانی خۆی داوەتەوە ئەمڕۆکە کورد لەم بارە وەستاوو لاوازەشیدا هەڕەشەیەکی بەردەوامە بەرەو رووی هەر رامیارییەکی خۆکوژی‌و لەوەش زیاتر کێشەی سەرەکی ئەو دەوڵەتانەو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەشێ ئەو زەمەنە زۆر کورت بکرێتەوە کە کورد لە مافی

سەربەخۆیی خۆی بکات لە دوو جەمسەری ناوخۆو دەرەوەیدا بەسوود وەرگرتن لە مێژووی خۆی هەروەها بەسوودوەرگرتن لەبارودۆخی رامیاری نێودەوڵەتی ئەویش بە زاڵبوون بەسەر ئەو مانا مێژووییانەی کە کورد دەخەنە بازنەی بیری خۆکوژی دوژمنانیەوە.

بیری یاخود چەمکی دابەشبوونی رامیاریو رۆشنبیریو جوگرافی کە بۆماوەی زیاتر لە هەزار ساڵ کوردیان دەخستە سێبەری بیرە خۆ کوژییەکانەوە بەداخەوە هێشتا رەگە رەشەکانی لە کوردستاندا نەبڕاونەتەوە، یەککگرتنی سەرتاسەری کورد ئەو خەونە مێژووییە لەبیرکراوەیە کە بۆماوەیەکی درێژە دوژمنانی کورد هەوڵی نەزۆککردنی دەدەن بیری گوتاری رامیاری یەککگرتووی کورد ئەو ئامانجە پیرۆزەیە کە هەموو دوژمنانی کورد هەراسان دەکات لە راستیدا رەنگدانەوەیەکی مێژوویی بەهێزی دابەشبوونی کورد لە رابردووەوە باڵی بەسەر ئەمڕۆی کوردستاندا گرتووە ئەو دابەشبوونانەی هەمیشە وینەیەکن بۆ مانەوەی رامیاری پەرتکردنی مرۆڤ و خاکی کورد بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ کە لەهەمان کاتیشدا دەربڕین لە دەسەلاتی دوژمنانی کورد دەکەن بەسەر داهاتووی کورددا. کاتێك دەرك بەوە دەکەین کە ململانێی ناوخۆیی لەسەرەوەی هەموو مەیل و میواکانی نەتەوەی کوردەوەیە لەم کاتەدا هەست بەوە دەکەین ئێمە لە تراژیدیای پەرتبوونی مێژوویی نەتەوەکەماندا دەژیێین و ئەو مێژووە زاڵە ژیان بەرۆحی مردوویدا دەکەین، ئەو کاتەش لەوە دەگەین کە هەستیاری مێژوویمان لە ئاستێکی چەن تراژیدی دایە ئەو تراژیدیایانەی وایان دەکرد رەوایەتیەکی نامرۆڤانە بە جەنگ ببخشرێت و هەموو هێماو ئاماژە مێژوویەکان لەمڕۆکەدا بزربن بێشك پێویستمان بە دابڕان هەیە لەگەڵ مێژوودا نەك بێینەوە ناو مێژوو.

هەربۆیە خوێندنەوەی بویەری ئەمڕۆی کورد بەدەیان پرسیارمان لەلادا گەڵاڵە دەکات، کە لەسەرووی هەموویانەوە دەرەوەی مێژوویی گەلی کوردە لەناوچەکەدا کارەساتەکانی جەنگی عیراق-ئێران و کوێت و کۆڕەوی ملیۆنی کورد نەتەوەی کوردی بەهێزەوە خستە هاوکێشەکانی رامیاری نێودەوڵەتیەوە ئەو گەمارۆ توندو تیژەی ماوەی سەد ساڵی رابردوو خرابووە سەر کێشەی کورد لەو دەوڵەتە نوێیانەدا بەتەواوەتی لەناوچوو مەسەلەی کوردو کاریگەری لە رووداوەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بووە واقیعێکی خۆ سەپێنەر بەرامبەر بەم رێککەوتە نێودەوڵەتیەش بویەری پەرتبوونی کوردو مانەوەی لە دۆخی دابەشبووندا لە بەرژەوەندی رامیاری هاوسەنگکردنی ناوچەییو نێودەوڵەتیش هێشتنەوەی کوردبوو بۆ ماوەیەکی درێژتر دوور لە خەون و خولیاکانی، بۆ یەکەمجار لەم مێژووە نوێیەدا کورد لە گەلی لەبیرکراوی رۆژهەلاتی ناوەڕاست و لە جەنگی لەبیرکراوی ناوچەکەدا بووە گەلێك کە شوێنی پرسیارو بەدواداچوون بێ. ئەم گواستنەوەیە لەهەمان کاتدا دەربڕین لە گواستنەوەیەکی رامیاریو دیپلۆماسیو عەسکەری دەکات لەناوچەکەدا.

خۆ دەربازکردن و خۆپاراستن لە بلۆك بەندی دەوڵەتانی ناوچەیی مەزنترین دەسکەوتی پرۆژەی رامیاری کورد دەبێ لەداهاتوودا کە هێزێکی پاشەکشێ پێکەری مێژوویی دەسپێنێتە سەر کورد زاڵ بوون بەسەر ئەو تەوژمە ئایدۆلۆژیی‌و تایفەگەرییانەی کە بۆماوەیەکی درێژو لەداهاتوودا دەشێ ببنە هێزی پاشەکشێ پێکەری مێژووی گەلی کورد پرۆژە ئازادیخوازەکانی هەروەکو چۆن دەبنە ئەو ناوەندەی پەرە بەدەستێوەردانی دەرەکی مەسەلەی کورد دەدەن. بایەخدان بەو پرۆژە فیکری‌و رۆشنبیریانەی لە قازانجی پەرەسەندنی مێژوو و شارستانیەتی کورددان کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ کەوتبووە ژێر کاریگەری رۆشنبیری گەلانی ناوچەکە، پاراستنی سەربەخۆیی بەرژەوەندی‌و بڕیاری سیاسی کورد، بەهێزکردنی پەیوەندی سیاسی‌و ئابووری‌و دپلۆماسی بەهێزو لەسەر بناغەی بەرژوەندییە داهاتوویەکان و خۆپاراستن لە مەیلی خۆکوژی لەناوبەری دوژمنانی کورد، هەوڵدان بۆ یەکخستنی گوتاری سیاسی کوردو سەرخستنی ئەو گوتارە بەسەر دابەش بوونی ناوەکیەوە ئەو هەنگاوانەن کەوا دەکەن نەتەوەی کورد بە قورساییەکی شارستانێتی گەورەترەوە لەناوچەکەدا بوونی خۆی بسەلمێنی‌و دەورێکی کاریگەرتری هەبێ لەو پلانانەی کە لە رۆژئاواوە بۆ سیاسەتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست داڕێژراون. ئەمەش مانای ئەوەیە مێژوو بە هەمووماناکۆنەکانیەوە لەو مانایانەی کورد لە قالبێکی مەیو نەگۆڕدا دەهێڵنەوەو وای لێدەکەن هەمیشە ئەو مانایە بە قازانجی ئەوان بکەوێتەوە چونکی باوڕی دوژمنانی کورد هێشتا هەر ئەو باوەڕە مێژووییە نەگۆڕەیە کە بەهۆی شێوازێکی رامیاری‌و ئابووری‌و رۆشنبیری دەستبخەنە چارەنووسی کوردەوە ئەو کێشەیەو هیواکانی کورد کرمی بکەن. گرەوی بردنەوەی مێژوو زالبوون بەسەر مانا پاشەکشێ پێکەرەکانی ئەو مێژووە کوشتنی مێژوویەکی زۆردارو چەسپاندنی مێژوویەکی دادپەروەرەترو یەکسان ترە کە تیایدا کورد دەبێتە خاوەنی بڕیارو ناسنامەو رامیاری خۆی مێژوو هەموو کاتێك بە یەکسانی ماناکانی خۆی دەسەپێنێتە سەر گەلان، گەلان دەزانن چۆن ئەو مانایانە بەکاردەخەن وجلەوگیریان دەکەن ئەمەیە دروستکردنی مێژوو.

# هەڵبژارتنا ژنێ د جڤاکا کوردەواریدا

□ جەمیل محەمەد شێلازی

(ژن و مێر بێن تفاق جهەك نابیت موقابل)

*ئەحمەدێ نالبەند*

(ژنا مێر ل پشتە، دونیاو عالەم چ تشتە؟!)

*گوتنا مەزنا*

ژن ل دەڤ گەلێ کورد یاخودان قەدرە، چ قەدرێ وێ ژیێ زەلامێ کێمتر نینە، نەمازە ئەگەر سالوخەتێت زانستیو پاقژیێو تەقوایێ ل دەڤ هەبن، ئو یا سەربەستە ژی د ناڤ مالێدا، نەو ب کەیفا خو دەردکەڤیت ژ بلی هندەك مالێت کێم، بەلێ بەداخەوە ئەو د شویکرنا خودا نەشێت بوخو هەلبژێریت، شویکرنا وێ بێ رازیبونا دەیبا باچێنا بیت ئەوێت کو گەلەك جار نابەرە خودەنە بەرژەوەندیێت وێ، ئونا بەرە خودەنە هەست و بوچونێت وێ، بەلکو ئەو بەس بەرە خوەدەنە بەرژەوەندیێت خو..[١]

ددەرحەقا ژنێ دجظاکێ کوردەواریدا(ڤاسیل) دبێژیت:- (کورد چ جا هزر ناکەن کو ئەو بەرتەنگێ بێخنە دژنکێدا، بەلکو ئەو هەموو دەماوی ددانن جهێ باوەریێ ئو خودان ماف و بەرپرسی ئەوێت زەلامی هەین..ئەڤە دیار دکەت ژ لایێ دەرونی ڤە کو ژن خودانا وان قەدرانە یێت زەلامی هەبن)..[٢]

بەرە خودانا جظاکێ مەبو ژنێ ب چاڤەك روهن و ئاشکرا دنێرنێ و بهایەکێ باش ددەنە ژنێ، هەروەکی ئەڤە بومە ئاشکەرا دبیت دەمێ ئەم سامانێ باب و باپیرا ڤە دخوینین، نەمازا(گوتنێت مەزنا)، کو دیارە دبیت کا چەند پویتە دایە ژنێ، بو ڤێ چەندێ ژی(دکتۆرە شوکریە) دبێژیت(پەندو قسەی پێشینانی کوردی سامانێکی فراوان و بەپێی باری کۆمەڵایەتیو پەیوەندی خێزانیو بە روونی لە هەڵوێست پتەوی خێزان ئەدوێن ئەمەش وا دیارە لە ئەنجامی پەیوەندی پتەوی تیرەو پێکەوەنانی خێزانی گەورەی بەردەوامی پشتاوپشت پێکهاتووە، لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردیدا گرنگیەکی زۆر دراوە بە پەیوەندی ناو ماڵ و هەموو ئەندامانی خێزان بەتایبەتیو خێزان بەتێکڕاییو رێکخستنی پەیوەندی نێوانیان(پیاو گەورەی ماڵە) (ژن کۆڵەگەی ماڵە)[٣].

لەورا ژن نینان د چاڤێ جڤاکێ مەدا تشتەك پیرۆزە، هەردەم ب دیتبینا ئیسلامێ بەرە خودایە هەڵبژارتنا ژنێ، نەو سال و خەتێت ئیسلامێ دانایێ بو هەلبژارتنا هەڤکویڤا ژینا خو، هەربو ڤێ چەندێ(میجەر نوئێل) دبێژیت: (ژنهێنان بەلای کوردەکانەوە زۆر پیرۆزە لە گەلێك لە موسڵمانەکانی دیکەی عەجەم و تورکمان بە بایەخ تەماشای ئەو پەیوەندیە دەکەن، نافرەت لە کوردستانا، لە چاو نافرەتە موسڵمانەکانی ترا نازادترن، زۆربەی ژنهێنان و شوکردن لەناو

کوردەکانا، لە ئـەنجامی دڵ و دڵخوازیـەوە سـەرهەڵدەدات، ئـەو یەککـەوتنـەی لـەو ئەنجامـەوە پەیدا دەبێت دەورێکی باڵاو سەرەکی دەگێرێت لە خێزانی نوێدا).

جڤاکێ مە هـەر ژ پـەیدابونا ئیسـلامێ، باوەڕی پـێ ئینایـە، ل دویـڤ رێبازا وێ چویـە، ب دیتنا ئیسلامێ وێژی نێرین ل جڤاکێ کریـە..ئـەو مـافێت ئیسـلامێ بـو ژنـێ تـەرخانکرین جڤاکێ مە ژی بو ژنـێ ب کارئینانـە، بـەلێ مخابن هندەك ژ وان مافا، لڤـێ دویماهیێ هاتینە بەرزەکرن، هندەك ئاستەنگ کەفتینە درێکا کـچ و کـوڕادا، مینا نـەختێت گـران، کـو ئـەڤ ئاستەنگێت هوسا بوینە ئەگەر کو هندەك خەلەتی ژ لایێ کچ و کوڕا ڤە رویدەن، وەك:

ئێك:- رەڤاندن وەکێ گەنج نەشێت هەڤگیانا خۆ بخازێت، ژبەر نـەختێت (قەلـەن) یـت گـران، نەچار دبیت، دەست ب رەڤاندنێ بکەت، کو گەلەك جار ئەڤ رەڤاندنە دبیتە ئەگەرێ کوشتنا وان..(مەلا ئەنوەر) دبێژیت: (رەڤـاندن هـەبوو دنـاڤ کـوردادا هـەر ژ دەستپێکا دیرۆکـێ هـەتا نهۆ ژی، ئەڤ عەدەتە دەست ب زێدەبونێ و بـەلاڤ بونـێ کر نـەمازە دنـاڤ گوندادا پشـتی وە نـەکری ژنك هـەلبژێریت، ئـو نـەخت ئاشـکرا بویـن، ئـو ژبـەر نـەزانینا هنـدەك مـەلا دکارئینانـا مـەرجێت مـەهر کرنـێ‌دا پیـتر داغبـاری دزیدەبونـا رەڤـاندنێ هـەبوو، ئـو سیسـتەمێ تەخا( گبقات) ژی بەهەرەك تێدا هەبو)..

هەروەسا(ڤاسیل) دبێژیت: (خەلکێ ئویجاخا(بلباس) وەناکەن کچێت خوە بدەنە ژ دەرەڤەی ئویجاخا خو، بەلێ رویدانێت رەڤاندنا کچێت وان دناڤ ڤێ ئویجاخێدا د زورن).

دوو:- دەهمـان پیسـی(زنـا) هـەر ژ بـەر هنـدەك ئاستەنگێت بەری نوکە مە بەحس ژێ کـرن، دەهمـان پیسـی چێ‌دبیـت، ئەڤـە ژی دبیتـە ئەگـەرا کوشـتان وان، دەربـارەی ڤـێ چـەندێ ژێ(میجەر نوئێل) دبێژیت: (ئافرەتی کورد بەداوێن پاکیو رەوشت بەرزی ناسراون) (تەنها سزای زیناو داوێن پیسی لەلای هەموو خێڵە کوردەکان کوشتنە).

کو بەرپرسیا ڤێ رویدانێ دزڤریتە سەر ستویێ بابێ کچکی، یێ و بو ئاستەنگ د شویکرنا کچا خوەدا، لەوما(نالبەند) دبێژیت: (کچا دل چو هەڤکویفی وارس نەدەت مەسئولە)

لەوما ژی د شەریعەتی‌دا ئەگەر یێ دەهمـان پیسـیێ دکەن(کوڕو کچ) بن ناهێنە کوشتن، بەلکو سزای وان(سەد) جەلدەنە، هەر وەك دقورئانا پیرۆزدا هاتیە: (الزانیه والزانی فاجلد کل واحد منهما مائه جلده....)النور/ آیە ٢. ئو ئەڤێت کەتینە دڤێ کریارێ‌دا، دێ ل ئێك و دوو هێنە مارە کرن، یان یێت وەکو وان، ل دویـڤ گوتنـان خـودێ: (الزانـی لا ینکـح الا زانیـە او مشرکە والزانیه لا ینکحهما الا زان او مشرك وحرم ژلك علی المؤمنین...) النور/آیە ٣. ئانکو مرۆڤێ دەلنگ پیسـی کـر، شـویێ ناکـەت ئێلا دەهمـان پیسـەك ئـان ئـەوا شـریکا بـو خـودێ چێدکەت ئو دەهمـان پیسا مـارە ناکـەت ئێلا دەلنـك پیسـەك یـان ئـەوێ شـریکا بـو خـودێ چێدکەت، ئو ئەڤێت هوسا لسەر خودان ئیمان د حەرامن).. د جڤاکا مەیا کوردەواری ژی دا، ب ڤێ دێربینێ بەرە خودایێ، دبێژن:- (ماستێ سەیی پیسکری هەر ژ سەی را باشە!)(٩).

هەروەسا دیتنـا(نالبـەند)ی ژی، بوڤـێ چـەندێ وەسـایە، لـەورا شیرەتال بابێ(کـچ و کـوڕا) دکـەت، کـو ئەگـەر وان دل چـو شـویکرنـێ و ژنـێ، وان بدەنـە شـوویو ژنـا بـووان بینـن داکـو

توشی ڤیٚ خەلەتییٚ نەبن، لەورا ژی هەر نالەبەند ل دویڤ گوتنا مەزنایا بوری دبیژیت(داسە نەچن دارینا!)..کو ئەڤە درگە(کنایە) بو(دەلنگ پیسییٚ):-

*کچا ب نەن تەقوا دینا          کـــورِی ژنـــێ بـــو بیـــنی*

*داسە نەچن داریـــنا          تـــودیٚ هـــو ســـەر هـــەلینی..*[10]

خودیٚ دقورئانا پیروزدا دبیژت: (ومن آیاته ان خلق لکم من انفسکم ازواجا لتسکنوا الیما وجعل بینکم موده ورحمه...) الـروم/ الآیـات ٢١. ئـانکو ژن بـو زەلامـی هـەردەم جـهیٚ رەحمەتیٚیەو ئەو بوئێك هەردەم ڤیان و دلوڤانییە..لیٚ مخابن دناڤبەرا هندەك ژن و مێرادا نەڤە نینە، بەلکو هەردەم نەڤێککرن(خلافات) پەیدا دبن، ڤێك ناکەن ناڤ چاڤێت وان ل ئێك. دوو گرینە، کو ئەوژی بیٚ گومان ژ چەند ئەگەرە کایە، وەك:

- ئێك: هەلبژارتنا نەباش..ئانکو لظێرە ناسحکەنە هندەك سەخلەت(صفه) تێت باش ل دەڤ ژنیٚ، بەلکو دیٚ سەحکەنە جوانیو دەراڤ و ناڤ و دەنگێت ژنیٚ، لەوما(ئەبی سەعید ل خوردی)، ژ زاریٚ پێغەمبەری دبێژیت: (هشیار بن ژ گیاییٚ سەر گویفکا: گوتیٚ: ئەی قاسدیٚ خودیٚ، گیاییٚ سەر گویفکا چییە؟ گوتیٚ: ژنا جوان بیت بەلیٚ یا بیٚ تورەو سنج بیت..)..(ژ ریوایەتا دارقوتنی وعەسکەریو ئیبن عودەی)..

جظاکیٚ مە ب چاڤەکیٚ روهن بەرە خودایە وان کەسایێت وەسا بەرەخوددەنە ژنیٚ، وەکی ژڤان گوتنا دیاربیت: (دە وارا نەکرە ل نیسانیٚ و ژنا نەبژێرە ژ دیلانیٚ!)[11].. یان( جوانیا ژنیٚ نان نییە دیٚ خون!)[12]..

بێگومان دڤیٚ گوتنیٚدا ئارمانج جوانیا ویٚ ژنیٚیە ئەگەر وەکی گیاییٚ سەر گویفکی بیت، چونکی گیاییٚ سەرگویفکا ژی گەلەکیٚ کەسکەو ییٚ تازەیە. بەلیٚ دبیت ل سەر پیساتیا مروڤا یان جانەوەرا شین بویە!

دوو: نەبونا وەکهەیظیٚ دناڤبەرا ژن و مێرادا.. ئانکو ئەگەر ژن و مێرا وەکهەڤی دناڤبەرا واندا نەبیت، نە ل رێزەکیٚ بن دبیتە ئەگەریٚ نەڤێکرنیٚ دناڤبەرا واندا، لەو ماپێغەمبەر(سەلامیٚ خودیٚ لسەر بیت) گوت: ژن ناهێتە مارەکرن ئیلا ب فەرمانا(ولی) ئونا هێتە شویکرن ئیلا ژ وەکهەڤیەکی).. هەروەسا ئیمامیٚ علی(خودیٚ لیٚ رازی بیت) ژ پێغەمبەری(سـەلامیٚ خـودیٚ لسەر بیت) ڤەد گوهێزیت: (نەی علی سیٚ تشـت ناهێنـە گـیروکرن،......، وکچـیٚ وەکـی وەکهەڤەك بو پەیدا دبیت)..(ژ ریوایەتا بەیهەقیو ئەحمەدی) جظاکا مەژی ب ڤیٚ دێربینـی دنێریتە شوییٚ کچیٚ، لەوما دبێژن: (شوییٚ ئەڤرو بوسوبەهی نەهێلە)[3] یان(دوو سەرێت نە ژ رەنگەکی، ناکەڤن سەر بالگەهەکی!).. یان(سـەریٚ نـە بسەرێکظە ناچن دەڤ ئێکظـە!)[15] یان(هەر کەزی زەرەکیٚ سمبێل سورەك ل بەرە)[16]..یان(ژنێت جوان مێرێت جوان دڤێن)[17]..

- سیٚ: جیاوازیا ژی: کو ئەڤە ڤیٚ گاڤیٚ گەلەك ئارێشەکا مەزنـە دناڤ جظاکا مەدا، وەك دیبینیٚ دوو پیرەمێرا کچێت خـو دانەئێك، دوویظدا چەندین رویدانێن دهمان پیسییٚو بەردانیٚ رویدەن ژ بەرکو گەلەك جیاوازی دناڤبەرا وان دا هەیە، ئەڤ پیرەمێرە(غەریزێت) گوە نێلیٚ بێت ویٚ کچیٚ تێر ناکەت، هەروەکی چاوا ژنەك یا سەرەنەشێت(غەریزێت، گەنجەکی

تیرکەت..(ئەو گوتنێت دخالا بوریدە، هەربو ڤێ خالێ ژی دکونجن، نەپێدڤی دووبارە کرنێنە)..

• چوار: هەروەسا هندەك ئەگەرێت دی ژی هەنە، دێبینی دبنە ئەگەرا نەڤیککرنا ژن و مێرا، ژوان:-

أ- ئەمێ د چەرخێ بیستێ دا، هێشتا یا ژ هەندەك مێراڤە، ژن بەس بو تراناو بچویك بونێ بتنێیە..بەلێ ئەو نە سەحكەنە بەرپرسیا داخازێت ژینە ژن و مێر ینێ ژ هاریكاری راستگوّیی و ماف و پێدڤیێت ژن و مێرنیێ و راوەستانا دگەل توخیبێت خودێ..(جارەكی ئێكی قەستا ئیمامێ عومەر)كر، داكو شكایەتا ژنا خو بینیتە دەڤ، كو گەلەك پت-پتێ بسەرێ مێریێ خو دادكەت..پاشی وی دیت ژنا عومەرێ ژی وەكی یاوی یا گازنداو پت-پتێ دكەت، ئو عومەرێ یاخو متكری!..هەما هێدی ژ ڤریڤە، ئینا عومەری گازیكرێ، كاوەرە كاتو هاتبویە چ؟ گوتێ: یا ئیمام ئەز هاتبوم شكایەتا ژنا خو بینمە نك تە، بەلێ من دیت ژنكا تە ژی وەكی یامن یا پت-پتێ بەسەرێ تەدا دكەت! ئو تەیاخو مت كری! ئینا گوتێ: ما ژنكاتە(جلكێت تە ناشوت! شیرێ ناداتە زاروكێت تە؟ زادێ بوتە نالێنێت؟ مالێ ناپاقژكەت؟ هتد) ئو ئەڤە هەمی لسەروێ دپێتڤی نین بوتە بكەت، دڤیایە با تە خدامەك بو گرتبا! ڤێجار تو ژی هەرە، یێ بێهن فرە هەبە دگەل وێدا)..

ب- كێم هەنە كو نەزانن(احكام) یێت ژن ئینانێ چنە؟ بەلێ پویتەی نادەنێ، لەوما دبنە ئەگەرا ڤێككنەكرنا ژن و مێرا..

ج- پیتر ژ وان ژنا ژی ب وان مافا ناڕابن یێت لسەر وی دپێدڤی، ئەو ژی ژ ئەگەرا ئەو پێنزانیت یان ژی ب پشت گوهڤە دهاڤێژیت، یان هەما پێ نارابیت!..

هەلبەت ئەگەر ئەڤ خالێت بوری، مانە دناڤبەرا ژن و مێرادا، تشتەكێ گومان برە، دێ هردەم دلگرانی دناڤبەرا واندا هەبیت و(خیلافات) كەڤنە دناڤبەرا واندا، ژیانەكا پر تەحل و ترشی دگەل ئێك بورینن(ئەگەر مادگەلێكدا) یان دێ بیتە ئەگەرا ژێكڤەبوونا وان(نالبەند) دبێژیت:

*ژنا نەعیم ترشو توند* — *خوشترە ل مێری مرن*[18]

ئەگەر(خیلافات) كەفتنە دناڤبەرا وان، ئێدی ئەو ژن ژی بویتەی نادەتە مالا خو، دبیت هردەم بەرێ وێ ژدەرڤە بیت، هەتا دبیت ئەو(اسرار) یێت مێرێ خو نە ڤەشێریت..لەوما(نالبەند) هندەك مالك لسەرڤان جورە توخمێت ژنا ڤەهاندنە وەك، دبێژیت:

*ژنا نەبیت سور ڤەشێر* — *ئەو قاتلە بو مێری*
*ژێ ئێمن نەبن چو مێر* — *دێ بەرانی لەتشێری*
*ئەو كێمن خەبەر ڤە كێر* — *شولا ل وێ هەسپێری*[19].

هەروەسا دبێژیت:-

ژنك بن كولانی بترسینن ئەحمەقا[20]

ئەڤ مالكە لدویڤ وێ گوتنا مەزنا هاتیە ڤەهاندن، یا كو دبێژیت: (سەر بچویكا پێ مەزن نە خوزیا وێ مالا تولێ دبیە ژن، سەرمەزنا پێ بچویك خوزیا وێ مالا تولێ دبیە بویك)[21]..ئانكو

ئەو ژنا كێم هوش(عقل) بیت گەلەكا گەروك بیت دەردە بومێرێ، بەلێ یا گەلەك هوشی هەبیت یا كێم دەر كەفتنا ژ قەستا بیت، خوزیكا وێ مالا ئەو تێدا بویك..هەروەسا دبێژن:-
(ژنا چاڤ ل دەرە، مێرێ خولی سەرە!)[٢٢]..

ئەو ژنا ئەڤ سەخلەتە ل دەڤ هەبن، ئەو هەمی دەردن بو مێری، ئەڤە دێ دچارچوڤێ وێ ئایا تا قورئانێدا دەركەڤن یا كو دبێژیت(ژن و مێر، ڤیان و دلوڤانیو رەحتی نە بوئێك)..دێ(اسلوب)ەكێ دی دگەل ڤێ ژنێ هێتە ب كارئینانەن، حەتا دزڤریتە ڤە، یانژی دویماهیكا وان ژێكظە بونە..ئەو ژی(چویڤ)ە دویما هیێیە، بو راستكرنا ژنێ خەلەتیا، یانژی بەرداناوێ..لەوما مەزن دبێژن: (ژن ب پێنا، دار ب سپێنا!)[٢٣]..ئەڤە نەبو هەر ژنكەكێ بیت هاتیە گوتن، نا! هەر دارەكێ بیت سپێنا بكار نائینن بو قەدكرن و كەلاشتناوی، بەلكو دارێ ئازاو ب زەحمەت بیت، لەورا چیڤ ژی نەبو هەر ژنەكێ بیت، بەلكو یاچو رێكا ژێ نەبەن، بەرێ وێ دكەڤیتە خەلەتیا ل خو نەزڤریت..(نالبەند) ژی شێوێ كارئینانا چیظی دهوزانا خو بكار ئینایە:-

| | |
|---|---|
| *مالا نەبیت پاقژی* | *دین نالەت چو رەونەقا* |
| *ئەگەر حەزكەی باش ببژی* | *ژنێ تامركە ب شەقا* |
| *لازمە تووێ ب كوژی* | *یان دڤێت ئەو بكریت سەقا!*[٢٤] |

ئەڤ(وسیله) یا هاتیە وەرگرتن ژڤێ ئایەتا پیروز: (...واللاتی تخافون نشوزهن فعظوهن واهجروهن في المضاجع واضربوهن فان اطعنكم فلا تبغوا علیهن سبیلا) النساء/ الایە ٣٤.لظێرە دبێژیت: ئەو ژنكێت ژبن گوهداریا مێرێ خو دەركەفتن یان بەرێ وان چو خەلەتیێ، هوین شیرەتا لێ بكەن. ئەگەر نەزڤرین، هوین هەیامەكی ل دەڤ نەنظن ئانكو(كنایە) تە نەچنە لحێفكا وێ، ئەگەر هەر نەزڤرین، بقوتن بەلێ(سەرو چاڤ و عەردێت ب زەرەر نا)، ئەگەر نەزڤرین(وسیله) دویماهیكێ دێ سەراست كەت ئانكو دێ بەردەت، كو ئەو ژی(ابغض الحلال عند الله!)..

بەلێ ئەگەر بنێرینە ئیسلامێ دێ بینن، هندەك شەنگەستە دانانە بو ئاڤاكرنا جظاكێ، ئەو ژی هەلبژارتنا ژنێ ب شێوەكێ دروست بەلێ بەری ژنێ بهەلبژێریت دڤێت ئارمانجا وی ژ ژن ئینانێ:-

• ئێك:- ژبو ئاڤاكرنا جظاكەكێ بیت، داكو ڤنێتەكا(ژریە) قەنج و باش هەبیت، ژبو هلگرتنا وی ئەمما نەتێ خودێ یێ بەرزو بلند، ژبو بەردەوام بونا ڤنێتێ، وەك خودێ ژ قورئانێدا دبێژیت: ( ژریە بعضها من بعض) آل عمران/٣٤..

• دوو: هەروەسا ئارمانج ژڤێ ژن ئینانێ یان شویكرن..داكو خو ژ بەرەخودانا حەرام بدەت پاش و لەشێ خو ژ گونەهێ بپارێزیت، لەوما یێ ئارمانجا وی ئەڤبیت، پێغەمبەر(سەلامێ خودێ لسەر بیت) د دەرهەڤا واندا دبێژیت، خودێ(جل جلالە) دبێژیت: (سێ كەسا ماف هەیە ئەز هاریكاریا وان بكەم،........،ئو ئەوێ ژنێ دئینیت داكو بمینیتە

پاقژ..)..ریوایەتا ترمژی).. لەوما مەزن ژی دبیژن: (حیزا میری خو بە دزا مالا خوبە!)[٢٥] یان(ژنا چاڤ ل دەرە میری خولی سەرە!)[٢٦]..

● سێ: ئارمانجا مروڤێ یا خودان سنج و دین ب هەلبژێریت، بلا خودان دەراڤ و جوانی نەبیت. وەکی پێغەمبەر(سەلامێ خودێ لسەر بیت) دبێژیت: (هوین ژنێ نەئینن ژبەر جوانیا وێ. وە هەیە جوانیا وێ بچیت. ئو هوین ژ بەر دەراڤێ وێ نەئینن. وەهەیە خو لسەر سەرێ تە مەزن بکەت، بەلێ هوین بینن ژ بەر دینێ وێ، کچەکا گوهـ سمتی(گوهدار)و یارەش ئو یاخودان دین ئەو چێترە).(ریوایەتا ئبن ماجەی)..

لڤێرە ژی نە ئارمانج پێ ئەوە. کو دبینرا نەسەحکەنە جوانیێ، بەلکو ئارمانج ئەو جوانیێت پویتەی نەدەنە مالێ. لەورا مەزن ژی دبێژن: (جوانیا ژنێ ل ژنێ بەلایە)[١٢] یان(بسک قژێ دەرو مال کولان پاکژێ، بسک حلی یێ دەرو کولان گیییێ!)[٢٨] یان(ژنا جوان دەردێ بێ دەرمان نەتێ کوشتن نەتەلاق دان!)[٢٩]..

رامان ژڤان گوتنا ئەو ژنکێ بەس پویتەی ددەنە جوانیێ، ئاگەهـ ژمال و میرێ خونینە!..لەوما هەمی ژن ناکەڤنە دچار چوڤێ ڤان گوتنادا..

● چوار: ئارمانجا مروڤێ ئەو بیت، ژبن فەرمانێت خودێ نەدەرکەڤیت، مروڤ خو بپارێزیت، خودێ ژ مروڤێ عاجز نەبیت و تولا ل مروڤیڤە کەت!.

ئەڤجار ئەو تشتێ سەرنجا مروڤی دکێشیتە خو، ئەوە ئیسلامێ پویتە نە دایە پەروەردکرنا زاروکی، دەمێ خودێ ددەت. یان ئەو هێشتا دمالپێچا دایکێ دا، بەلکو هێشتا د بەری ڤی دەمی دا ب وەختەکێ درێژتر شەنگەستەکێ موکوم و ساخلەم بو دانا، ئەو ژی هەلبژارتنا ژن و میرا..ئیسلام ژ ژن و میرا دخازیت ئەوان هندەك سەخلەتێت جڤاکیو دەرونی پێت سکونجن دگەلێك دا هەبن، ب وێ هیڤیێ داکو تێگەهەشتنا وان بو ئێك ودوو هەبیت و پاراستنێ لسەر خێزان و زاروکان بکەت..

لەوما پێتڤی یە دساخلەم بن ژ هەمی کێماسیو نەباشیا چ پێت سنجی بن یانژی ئیشێت(وراپی)بن، یانژی پێت دەرونی(نفسی)بن!..چونکی زاروك وەکە دەرامەتیە، ئەڤجار ئەگەر مروڤی بڤیت دەرامەتەکێ باش بیت، دڤێت باش ب هەلبژێریت، ئو دڤێت بزانیت ئەردەکێ باش ژی ب هەلبژێریت بوڤی توڤی، دا لێ بچینن..چونکی هندی توڤ یێ باش بیت، بەلێ ئەردیێ نەباش بیت، ئەو چو مفایی ل چاندنێ ناکەت، بەلێ چەندین ئەردو توڤ دباش بن، دەرامەت ژی دێ یێ باش بیت، لەوما مەزن ژی دبێژن: (تو چ ب چینی دێ وی هەلینی!)[٣٠] یان (چ دکەن کوا رێ ئەو دهێتە خوارێ!)[٣١]..

لەوما هەلبژارتنا ژن و میرا مافەکێ(مشروع)ە بو هەردوو لا، ئو ئیسلامێ پویتە دایە هەلبژارتنا هەڤکویڤێ(شریك)ی دوویێ ژ بەر داکوژیانا ژن و میرا نەبوهژیت..ڤێجا هندەك سەخلەت هەنە ژبو هەلبژارتنا ژنێ، نە هەما(هەچیا دبینم تێ دوەرینم!)..بەلکو دڤێت هندەك توخیب هەبن، مروڤ ژێ نەبوریت، دقورئانا پیروز دا هاتیە(الخبیثات للخبیثین والخبیثون للخبیثات والطیبات للطیبین والطیبون للطیبات )النور/ الآیە ٢٦.. ئانکو ژنێت پیس بو میرێت پیس ئو بەرو ڤاژی، هەروەسا ژنێت قەنج بو زەلامێت قەنج ئو بەرو ڤاژی..

دا سەحكەينە سەخلەتێت ژنا باش ب دیتنا ئیسلامیێ و جڤاکیێ مە، کادێ کیش ژنێ هەلبژێرین؟..

• ئێك: دین..یا خودان دین بیت، ژبەر گوتنا پێغەمبەری(سەلامێ خودێ لسەر بیت) وەکی، دبێژیت: (ژن تێ مەهرکرن بو چار تشتا، بو تازەهیا وێ یان بنەمالیا وێ یان ژی بومالێ وێ یان ژی بو دینێ وێ، ڤێجار خوە ب یاخوەیی دین را بگەهینە هەی دەستی تەب ئاخێ کەتبو)[32]..چونکی یاخودان دین دگەل زەلامیدا دسەر فەرازن، مەزن دبێژن: (ژن سەرێ مێری دهەلینیت، ژن سەرێ میرێ دچەمینیت!)[33].. یان(ژنابێ حەیا وەك گرارا بێ خوێیە)[34] پێنەڤێت کو شەرم(حەیا) چەقەکە ژ چەڤێت ئیمانێ..هەروەسا دبێژن: (سێ تشت کەفتنە رێکێ-زانین و مال و شەرەف-زانینێ گو: ئەز بچم دێ من ل دێرو مزگەفتا بینن ڤە، مالی گو ئەز بچم دێ من ل نك کە تخۆدا- یان بینەڤە، شەرەفێ گو: ئەگەر ئەز بچم من نا بهێنەڤە!)[35]..

• دوو: یا خودان رەوشت و سنج(خلق) بیت: ئەگەر ژن یا بێ رەوشت و سنج بیت، دبیتە ئەگەرێ هەرفاندنا جڤاکی..لەورا جڤاکێ مە پویتە دایەڤێ خالێ، دەبیا هەلبژارتنا ژنێ، یا خودان سنج بیت، لەوما مەزن دبێژن: (ژنا بینە ژ عەسلیا، ئاڤێ بینە ژ کانیا، دا ببینن عەجێیا!)[36]..یان(ژنابێ عەسل دەردە، ژنا ب عەسل دەولەتە!)[37].. یان وەکی شیرتێ لمە دکەن خو ژیا نە ژمالەکا باش بدەنە پاش، (نەسەیێت دویڤ مالا، نە رەزێت ل کەندالا، نە ژنێت رەندالا، نەسیبەرێت سپیندارا!)[38]..

• سێ: یاباش چێکری بیت(حسن الخلق): ئەڤە ژی پێتظلییە، ل دەڤ ژنێ هەبن، نەکو یاشل و کورەو سەقەت و هتد. یان ئیشێت دەرونی هەبن، کو ببنە ئەگەرێ زاروکێت وانژی توشی ئێشێت ڤنێتی_وارسی) ببن..لەوما ژی پێغەمبەری(سەلامێ خودێ لسەر بیت) فەرمان دایە، وەکی ئێك ژنێ دخازیت، بوخو بەرەخو دەتە ئەوا بوخو د خازیت، چونکی دێ پتر بەردەوامی د ژیانا واندا پەیدا دبیت، هەروەکی وەسیەت ل(مغیرە)ەی کری و گوتی: (تو بوخو بەرەخودە ئەوا تو دخوازی، چونکی دێ پتر بەردەوامی دژینا هەوەدا پەیدا بیت)..(ژریوایەتا ترمزیو نسائی)..دیسان(ابو هریرە) دبێژیت، پێغەمبەری(سەلامێ خودێ لسەر بیت) گوتە زەلامەکی، وەکی ژنەك خواستی، گوتێ: (ئەرێ تە بەرە خودایی؟ گوتێ: نەخێر.. گوتێ: هەرە بەرە خودێ)..(ژ ریوایەتا هەرپێنجا)..

• چوار: یا کێم مەهر بیت..ل پێشیێ دڤێت بزانین نەخت(قەلەن) ژ مەهرێ جودایە، مەهر یا ژنکێیە کەسێ ماف تێ ناچیت بێ وی(تصرف)ێ تێدا بکەت، چ چەك بن چ ژی پارە بن چ ژی ملك بیت..بەلێ نەخت دهێتە وەرگرتن ژ لایێ دەیبا بێت کچکێ ڤە، بوخو دخازن نەك بو ژنکێ، ل دەڤ هندەکا د ناڤ جڤاکە مەدا، دگوت: (بێ نەختێ، بێ بەختێ!)[39]..ئانکو یا ژوان ڤە هندی بەلێ دیارە ژ بیر کریە، دبێژن: (نەختێ گران مالی وێران!)[39].. نەختێ کچاوان پتر بیت، دێ پتر یا ب قەدرو قیمەت بیت!..(مەلا ئەنوەر)د دەرحەڤا نەختێ دا دبێژیت: (یا پتر هەری رونکری، ئاشکرا بونا(نەخت)ایە. ل ڤێ دویماهیێ، ئانکو ل دەستپێکا چەرخێ

چواردێ مشەختی، ژ رەخەکی ڤە(ولایە) ژ رەخەکی ڤە نەخت کارتێکرن د سەربەستیا ژنێ دا کر د هەلبژارتنا ئەوێ وێ دڤێت، کو حەسدکەت ببیتە هەفکو وێ دژینیێدا)[٤٠]..
مەهر ژ مافێت ژنێیە بوخو بخازیت، یا سەر بەستە ژی هندی دڤێت، لێ وەکی پێغمبەری(سەلامێ خودێ لسەر بیت) دبێژیت(باشترێ هەرکارەکی یێ ناڤنجیە)..لەوما ژ بو ژیانەکا خوش، دەبیا یا کێم مەهر بیت..دیسان پێغەمبەر(سەلامێ خودێ لسەر بیت) دبێژیت: (ژ باشیا ژنێ مەهرا وێ کێم بیت، مەسرەفا داوەتا وێ کێم بیت، یا سنج باش بیت..نو ژ نەباشیا ژنێ: یا مەهر گران بیت، زێدە مەسرەفا داوەتا وێ، ئویا سنج نەباش بیت!)..دجڤاکێ مەژی دا دەرحەڤا وان یێت نەختا وەردگرن، یان مەهرێت گران، دبێژن: (هەچیێ ژنێ بخازیت دڤێت تورەك پارا هەبیت یان بارەك دەرەوا هەبیت!)[٤١]..

● پێنج: کچینی:- هەلبەت کچینی ل دەڤ وێ ژنا دهێتە هەلبژارتن تشتەکێ زور گرنگە. نە لەنك ئیسلامێو جڤاکێ مە بتنێ، بەلکو ل دەڤ هەر کەسەکی پویتەی ددتە ڤێ چەندێ(هەبونا پەردا کچینیێ)..لەورا(د. اوستاس چاسر) دپەرتوکا خودا(هژا الحب....) دبێژیت: (بوچی ئەڤ پویتە پێدانە ب پەردا کچینیێ؟ پویتە پێ دانا زەلامی ژ بو هەبونا پەردا کچینیێ ل دەڤ بویکێ ئیشارەتە ژبو مسوگەر کرنا پاقژیا وێ دبەری هنگێدا..ئەو دێ هزر ب خوشیێ کەت وەك پێ دحەسێت ئەو ئێکەم کەسە دچیتە دەڤ وێ بویکێ. ئەگەرا دویێ بێ کویرێ دەرونی بەروڤاژیە کە ژبو غەریزا ڤیانا مولکیەتێ دناڤ مروڤێدا، ئەو هەست ب هێزا خود یا بلند لسەر ژنکێ ئو ئاشکرا کرنا ڤێ سەرکەفتنێ خویا ب کریار(عمليا)[٤٢]..
لەورا جڤاکێ مەژی زور گرنگی دایە کچینیێ، دوێ دێرینیێرا بەرە خودەنێ مەزن دبێژن: (هەرەرێکێ بلا دویر بیت، بدە بوری بلایێ کویر بیت، کچی بینە بلا یا پیر بیت!)[٤٣]..یان(ئەو گرارا دووجارا کەلاندی، ئەو نانێ دوو جارا رەشاندی، ئەو بویکا دووجارا خەملاندی، دلائەو نە ئەڤاندی(حەباندی!)[٤٤]..یان(بینە کچا چل سالی، نەهینە بێژنا بیست سالی!)[٤٥].
نالبەند ژی دبێژیت:-

*هندی ژتە بێت بێژنا*     *حەوجە نەبە ب نیکاحێ!..*[٤٦]..

هندی کچ دوەختیدا شوی بکەت، چێتر دێ دویری خرابیا بیت، کو ئەڤە ژی تشتەکە ل دەڤ جڤاکا مەهیە، پتر یا هەمی گەلێت دەورو بەرێت مە، کچا دوەختێدا ددەنە شوی. لەوما(تومابوا) دبێژیت: (ئەم ژن هێنانە لەم تەمەنە کەمەدا یەکێکە لەو هۆیانەی وای لە کورد کردووە نەزانێت داوێن پیسی چییەو بەزاراوە تورکیەکان نەبێت نەتوانیان باسیان بکات!)[٤٧]..

● شەش: یا ژ ڤنێت بیت: ئانکو ئەو بیت یا کو زاروك ببن، کو نە ڤەژی پتر ژدایکێ دێ دیار بیتو ئەگەر دایکا وێ ئەو بیت یا گەلەك زاروك ببن. دێ ئەو ژی یا ژ ڤنێت بیت(ژ بلی ئەگەر خودێ ئێك کر بیتە بێبەر، خرش(عقیم)، هەما زاروك نەبن)..پێغەمبەر(سەلامێ خودێ لسەر بیت) دبێژیت: (هوین وێ ژنێ بینن یا ژ ڤنێت بیت و یا ب دلوڤانی بیت، ئو رەشەکا ژ

قنێت چێتره ژ جوانەکا نـه ژ قنێـت(عقیـم)..دەربـاراوا نێـت زاروك نـەبن(تومـابوا) دبێژیـت: (هـەروەها تـەڵاق دانیش تا رادده‌یـەك کەمـه، خو ئەگـەر هەشبیٚ هۆی سـەرەکی ئەوەیـە، کـه ئافرەت منالی نابێت یان منـالی ئەبیٚو کوری نابێت)[٤٨]..هەرچەنده بمن وەرە بەردانا ژنـیٚ ئەگەرا نەبونا زاروکا یان نەبونا کورا. ئەز دشیٚم بێژم هەما دناڤ جڤاکیٚ مەدا نینه، دبیت زەلام ژنـەك دی بینیت ب سەر هـەوی، داکـو زاروك بـبن، یـان کـور، لیٚ بـەردان تشـتەکیٚ زور نەخوشه، لەورا ژی(ابغض الحلال عند الله الگلاق)..جڤاکیٚ مەژیدا هاتیه(حەفت جار خو بده رەڤـاندن، جـارەکیٚ خونـه ده بـەردان!)[٤٩].. چونکـی(بویکـا دووجـار خـەملاندی، چـو دلا نەحەباندی!)..

• حەفت: یا ژ بنەماڵەکا خودان(نسب) عەسل بیت.. یاخودان رەوشتێت باش بیت، خودان قەدرو قیمەت بیت، سەنگا خو دناڤ جڤاکیٚدا هەبیت، لەوما مـەزن دبێژن: (عەسـلیٚ قیزیٚ چاوایه، قیز ژی وەسایه!)[٥٠].. یان(مەسەر دیت بیٚ کـەزی، دروار دیت بیٚ دەزی، دای دیت دلیٚ مه ژکچیٚ تەزی!)[٥١]..یان(ژ عەسلیا ب پرسه، ژبیٚ عەسلا ب ترسه)[٥٢]..یان (دایـیٚ ببینـه کچیٚ بستینه!)[٥٣]..یان(کچ تەشیا دایـیٚ درێسیت، کو رکڤانیٚ بابیٚ دکێشـیت)[٥٤]..یـان(ژ نـاخو نـاس دەولەتـه، ژ نـاخو نـەناس دەرده)[٥٥]..یـان(ژنـیٚ بینـه ژ مـالان، ئـاڤیٚ ڤـەخو ژ سەرکانیان)[٥٦].

• هەشت: یا بیانی بیت: کو پیتر ژیـان دناڤبـەرا ژن و مێرا دا ب شـادو بەختـەوەر دبیت و سەر فراز دبیت، پتر دلوڤانی پەیدا دبیت، دیٚ پتر ژ ئێشێت قنێتـی(وراسـی) ژی دویرکـەڤن، هەروەسـا ئەگـەر نـەڤیان ژی دناڤبـەرا وانـدا پـەیدا بـو، نابیتـه ئەگـەرا ژێـك دویـر کـەفتنا مروڤـانییٚ، وەکی هەکه ژ ئویجاخیٚ بیت لـەوما ژی شـەریعەتی دروست نـەکر دوو خویشـك دگەلێك دا ل ئێکی بهێنه مارەکرن، هەتا ئێك بمریت یان بهێتـه بـەردان، هەروەسا ژنکەك و مەتا ویٚ یان خالەتاویٚ نابیت دگـەلێك بهێنـه مـارەکرن، دقورئانـا پـیرۆزدا هاتیـه: (حرمـت علیکم.....وان تجمعوا بین الاختین الا ما قد سلف) النساء/ الآیه ٢٣..

هەروەسـا پێغمبـەر(سـەلامیٚ خـودیٚ لسـەر بیـت) دبێژیـت: (نـابیت ژنکـەکیٚو مـەتاویٚ یـان ژنکەکیٚو خالەتا ویٚ د گەلێك دا مارە بکەن!)..دهەردوو راستگویا دا هاتیه(ئەگەر هوین وه بکـەن هـەوە پـەیوەندیێت دلوڤـانییٚ ژێکەڤه کـرن)..(ئبن حـەبان)..(ڤاسـیل) دبێژیـت: (خـەلکیٚ ئویجاخا(بلباس) وەناکەت کچێت خو بدەنه ژدەرڤەی ئویجاخا خو، بەلیٚ رویدانێت رەڤاندنا کچێت وان دناڤ ڤیٚ ئوجاخیٚدا دزورن!)[٥٧]..

ئەنجامیٚ سەخلەتێت بوری، ئەگەر ژنکیٚ ئەڤ سەخلەته ل دەڤ بن، دیٚ ژوان ژنا بیت کو دقورئانا پیرۆزدا پەسنا وان دکەت، دفەرموت: (فالصالحات قانتات حافظات للغیب بما حفظ الله) النساء/الایه ٣٤..ئانکو(ئەوێت قەنج دیٚ دگوهداری خودیٚو زەلامیٚ خوبن، دپاراستی بن غەیبـەتا زەلامێـت خـو بـو کەسـیٚ ناکـەن چ ناموسـیا وان یـان مـالیٚ وان یـان زارویێـت وان...)..هەروەسا دئایەتەکادا دبێژیت: (مسلمات مؤمنات قانتات.... هتد التحریم الایه(٥) (.خوشکاندینه بو خودیٚو باورەی ب خودیٚو پێغەمبەری هەیەو د زڤرنەوی تشتیٚ خودیٚ حـەژیٚ دکـەت، ب تاعـەتێت خو بو خودیٚ خو دچەمینن، دروژیگرن وەکی ڤ مێر دگـەڤن ژ

کچینی دکەڤن، کەسەك دی نێزیك وان نەبویە).. باشترین نمونە بو پەسنێت بوری ژی، دا سەحکەینە ڤێ سەرهاتیێ:-

جارەکێ ئیمامێ عومەر(خودێ لێ رازی بیت)، ب شەڤێ دناڤ مالا دا دچو، گو ل دەنگێ ژنکەکێ بو، یا دبێژیت:

*ئەڤ شەڤە چەند درێژ بو خلاس نابیت*

*ئونینە ب رەخ منڤە هەڤالەك تڕانا دگەل بکەم*

*ئەز بخودێ کەم ئەگەر ژ ترسا سزایێت خودێ نەبا*

*دا ئەڤ تەختە ژ هەر دوو لایاڤە هە ژ بێت*

*بەلێ ژ ترسا خودێ و شەرم ژی من دمێلیت پاڤژ*

*ئو ژ بەر قەدرێ میرێ خو داکو بکەمیتە پلێت خو..*

بو عومەری دیار بو کو ئەڤە ژنا سەربازەکێ بوسلمانە، ئەڤە دەمەکە مێرێ وێ چویە جیهادێ، ئو یا هێلایە بتنێ، بەلێ ژ ترسا ژ خودێ وشەرمادا نەوێریت چو زێدەگاڤیا بکەت!..لەوما عومەری فەرمان دا، کو چو سەرباز دەمەکێ درێژ نەمیننە ل مەیدانێت شەری، بەلکو دڤێت دەستویردان(اجازە) بو هەبن..

هەروەسا ئیسلامێ مافێ ژنێ ژبیر نەکریە، کو دڤێت زەلامێ بو ژنێ دهێتە هەلبژارتن، ویژی هندەك سالوخەت ل دەڤ هەبن، چونکی ئەگەر ژن وزەلامێ خو ڤێك نەکر، گەلەك بو زەلامی ب ساناهیە وێ ژنێ بەردەت، بەلێ ئەگەر زەلام ب دلی ژنێ نەبیت، گەلەکا ب زەحمەتە، هەتا ژنك داخازا سەر راستکرنێ ژێ دکەت..هەرچەندە ژنێ ژی مافێ هەیی خو بدەت بەردان بەلێ هندەك هوییێت عەشیری دبنە ئاستەنگ درێکا ژنکێ'دا..ڤێجار ماف بو ژنێ ژی هەنە مینا زەلامێ دهەلبژارتنا زەلامیدا، خودێ دفەرموت: (وانكحوا الايامى منكم والصالحين من عبادكم....)النور/ الآيه ٣٢.. هوین ژنا بو یێت بێ ژن بینن و ژنێت بێ مێر بدەنە شوی...هەروەسا پێغەمبەر(سەلامی خودێ لسەر بیت) دبێژیت: (ئەگەر ئێك هات کچا هەوە بخازیت، ئو هوین ژ دین و رەوشتێت وی درازی بن هوین کچا خو بدەنێ-ئەگەر ب دلێ هەردووکا بیت-ئەگەر هوین وەنەکەن دێ بیتە فتنەو فەسادی لسەر رویێ ئەردی!) (ژ ریواتا ترمزی)..لڤێرە ئارمانج ژ گوتنا پێغەمبەری(سەلامی خودێ لسەر بیت) ئەگەر وەنەکەن دێ بیتە فتنەوفەساد، ئانکو دێ وێ گاڤێ توشی دەهمان پیسیو رەڤاندنێ بن، لەورا پاش وێگاڤێ دەیبا باب بەرپرسیا وان خەلەتیا بکەت، هەروەکو نالبەند دبێژیت:-

| | |
|---|---|
| *کچا ب دەن تەقوا دینا* | *کـــوری ژنـــێ بوبینـــی* |
| *داســـە نەچن دارینا* | *تودێ هـۆ سـەرهەلینی* (٥٨) |

یان:-

| | |
|---|---|
| *کچا دل چو هەڤکو یفی* | *وارس نەدەت مەسئولە(٥٩)* |

لڤێرە سەخلەتێت باش لەنك زەلامی بومە دیار کرن، نەگوت: (ئەگەر ئێك هات کچا هەوە بخازیت هوین ژ دولارو ترومبیلێت وی درازی بن..) بەلکو ژ دین و سنجیت وی درازی

بن..هەروەسا زەلامەکی پسیار ژ(حەسەن)ی کر(خودێ لێ رازی بت) گوتی: (ئەز کچا خو بدەمە کیژکی؟ گوتی: تو سەحکە یێ خودان دین ئەگەر وی ڤییا دێ قەدەرێ وێ گریت، ئەگەر لبەرێك گران بون زولمێ لێ ناکەت!)..بەلێ ئەڤرو چەند هەنە ل ڤان سەخلەتا ناگەهن، بەلکو پسیارا قەسرو ترومبیل و دولارا دکەن، وەکی دبێژن:- (هەیی بە کورێ کەری بە!)[٦٠]..نابەرەخو دەنە دویماهیا ڤێ کچێ کادێ چ لێ هێت؟!..پێغەمبەر(سەلامێ خودێ لسەر بیت) ددەرحەقا ڤان(بابا)دا دبێژیت: (ئەوێ کچا خو ل مروڤەکێ فاسق مارەبکەت وی دلوڤانیا وێ کچێ ژخو بڕی!)..(ریوایەتا ئبن ماجە)ی..

دەهەمەن:-

١- الاکراد في بهدینان..بپ١٧٨.

٢- الاکراد(ڤاسیل).. بپ٨٨.

٣- پەندی پێشینان و....بپ١٠٠. کۆڵکەکە: (دعامە، عمود، قائمە، مسلە) بنێرە: ئەستێرە گەشە، فاضل نظام الدین، چاپی دووەم-١٩٨٩ بپ٤٠٨..

٤- یاددا شتەکانی مەیجەر نوئێل..بپ١٧٦.

٥- الاکراد فی بهدینان..بپ١٨٨.

٦- الاکراد(ڤاسیل).بپ٩٩.

٧- یادداشتەکانی....بپ١٧٨.

٨- ڤەفتەك ژ هوزانێت نالبەندی. بپ٢٤٥.

٩- گوتنێت مەزنا ل...بپ٩٥.

١٠- ڤەفتەك ژ...بپ٢٣٥.

١١- مشتاخا چیا ژ....بپ١١٨.

١٢- کانی، کومەڵە تێکستێ...بپ٣٦.

١٣- گوتنێت مەزنا ل...بپ٧٢.

١٤- گوتنێت مەزنان ل...بپ٥٤.

١٥- مشتاخا چیا ژ...بپ٢٠٠.

١٦- مشتاخا چیا ژ....بپ٢٨٦.

١٧- گوتنێت مەزنا ل...بپ٦٢.

١٨- ڤەفتەك ژ...بپ٢٢٨.

١٩- ڤەفتەك ژ..بپ٢٢٧.

٢٠- ڤەفتەك ژ.بپ١٤١.

٢١- کانی...بپ٧١.

٢٢- کانی...٦٦.

٢٣- کانی...٦٥.

٢٤- ڤەفتەك ژ...بپ٢٣٣.

٢٥- گوتنێت مەزنان ل...بپ٤٠.

٢٦- کومەلە تێکستێ فولکلوری کوردی، بپ٢١٧.

٢٧- کانی....بپ٣٦.

٢٨- كانى....بپ١٩.
٢٩- پەندى پێشینان و...بپ٨٠.
٣٠- مشتاخا چيا ژ...بپ٦٠.
٣١- مشتاخا چيا ژ...بپ٧٤.
٣٢- مشتاخا چيا ژ....بپ١٦٢.
٣٣- گوتنێت مەزنان ل...بپ٦٥.
٣٤- مشتاخا چيا ژ...بپ١٩٢.
٣٥- كانى...بپ٧٣.
٣٦- (ا) گوتنێت مەزنان ل...بپ٦٢(ب) دوو مروارى ژ...بپ٦١(ج) دلێنى بپ٦٤.
٣٧- (ا) كومەلە تێكستێ...بپ٢٣٧(ب) دلێنى(ج) گوتنێت مەزنان...بپ٦٤.
٣٨- ژ زار دەڤێ(جميل عمر شێلازى) ژيێ وى(٦١) سالە.
٣٩- گوتنێت مەزنان ل...بپ٢٦.. بوگوتنا(نەختێ گران....) بنێرە(ا) گوتنێت مەزنا ل بپ١٠٦(ب) كانى...بپ١١٤.
٤٠- الاكراد في بهدينان، بپ١٨٧.
٤١- گوتنێت مەزنا ل...بپ١٢١.
٤٢- هذا الحب واثرة في العلاقات الجنسية...بپ٤٤.
٤٣- (ا) دوو مرارى ژ...(ب) گوتنێت مەزنان ل...بپ١٩ كانى....بپ٢٠(د)دلێنى بپ٦٥.
٤٤- (ا) خان ومان بپ ٣٠ گوتنێت مەزنا مەزنا ل...بپ٧٧.
٤٥- گوتنێت مەزنان ل..بپ١٩.
٤٦- قەفتەك ژ...بپ٢٢٨.
٤٧- ژيانى كوردەوارى...بپ١٠٤.
٤٨- ژيانى كوردوارى...بپ١٠٥.
٤٩- دلێنى...بپ٦٧.
٥٠- (ا) دلێنى...بپ٦٨...بپ١٠.
٥١- دلێنى....بپ٦٤.
٥٢- دوومرارى ژ....بپ٨٤.
٥٣- (ا) گوتنێت مەزنا ل...بپ٢٤(ب) مشتاخا چيا ژ...بپ١٢٢.
٥٤- كانى....بپ٨٩.
٥٥- (ا) كانى..بپ٦٥ (ب)دلێنى...بپ٦٨.
٥٦- پەندى پێشینان و...بپ١٠١.
٥٧- الاكراد....بپ٩٩.
٥٨- قەفتەك ژ...٢٣٥.
٥٩- قەفتەك ژ....بپ٢٤٥.
٦٠- (ا)كانى بپ ١٢٨ گوتنێت مەزنا ل...بپ١١٦.

ژێدەر:-


١) انور مائى، الاكراد في بهدينان، ط٢، دهوك-١٩٩٩.
٢) ڤاسيل نيكتين، الاكراد، بيروت-١٩٦٧.

٣) توما بووا، ژیانی کوردەواری و. حەمە سەعید حەمە کەریم لە عەرەبییەوە-١٩٨٠.
٤) یادداشتەکانی میجەر نوئێل لە کوردستان، و.حسین احمد جاف- ١٩٨٤.
٥) د. اوستاس چاسر، هذا الحب واثره في العلاقات الجنسية، بيروت.
ژێدەرێت ئیسلامی:-
٦) احمد بن عبدالرحمن بن قدامة المقدسي، مختصر القاصدين، ط٢-١٩٩١م. ص٧٦-٧٨.
٧) د.يوسف القرضاوي، الحلال في الاسلام، ص١٦٧.
٨) محمد ناصر الدين الالباني، آداب الزفاف في السنة المطهرة، ط٩-بغداد ١٩٩١.
٩) فتحي يكن ، ماذا يعني انتمائي للاسلام؟ ص٥١-٥٤.
١٠) رعد كامل الحيالي، الزواج الاسلامي السعيد، ط١، ١٩٩٠، ص١٦-٢٣.
١١) رعد كامل الحيالي، الخلافات الزوجية، بغداد، ١٩٩٣، ط١، ص٩-٢٦.
١٢) عبدالحافظ الكبيسي، ويسألونك عن المراة، ص١٤٦، ١٦٣-١٦٤.
١٣) د. محمود بن الشريف، الاسلام والحياة الجنسية، بغداد، ١٩٨٨ ص٢٨-٣٢.
١٤) ابراهيم النعمة، اخلاقنا او الدمار، ط٢، ص٥٨-٥٩.
١٥) ابراهيم النعمة، اخلاقنا او الدمار، ط٢، ص٥٨-٥٩.
١٦) جلال العالم، قادة الغرب يقولون دمروا الاسلام وابيدوا اهله..
١٧) مجلة المجتمع، عبدالحميد البلالي، جفاف، العدد(١٢٦٩)، ٣-٩-١٩٩٧، ص٥٦.
ژێدەرێت گوتنێت مەزنان:-
١٨) حجی جعفر، گوتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان، بەغدا-١٩٨٦.
١٩) مەلا مەحمود دێرشەوی، مشتاخا چیا ژ گوتنێت پێشیا..
٢٠) ئەحمەد قەرەنی، کانی..کومەلە تێکستی فولکلوری کوردی، ١٩٨٥.
٢١) قەناتی کوردو، کومەلە تێکستی فولکلوری کوردی، بەغدا-١٩٧٦.
٢٢) پێزانیێ ئالیخانی، دوومرواری ژگەنجینا فولکلوریێ کوردی، ١٩٨٥.
٢٣) سەرفەراز علی نەقشبەندی، دلێنی(حەیرانۆك)...
٢٤) صادق بهاءالدین ئامێدی، خان و مان، بەغدا-١٩٨١.
٢٥) د.شوکریە رسول، پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی، ١٩٨٤.
* ئەو بخو ناڤ و نیشان(هەلبژارتنا ژنێ دناڤبەرا ئیسلام و جڤاکا مەدا( بو، لێ بەری ل سیمیناریێ پێشکێش کەم، هندەك برادەرا گوت:- هوسا دیێ جیاوازی کەڤیتە دناڤبەرا ئیسلام و جڤاکا مەدا، چونکی(٩٠٪) جڤاکامە بوسلمانە، لەورا ناڤیێ ویێ بو(هەلبژارتنا ژنێ د جڤاکا کوردەواری دا)..(ج.م)..
* * ئەم نابێژین نمونێت هوسا دناڤ جڤاکامەدا نین، چونکو ب هزارەها ژن ژ دەمیێ(نەنەفالا رەش) و سەرهلدانیێ شەرێت ڤیێ دویماهییێ مەمەنە، ئەڤ پاڤژیە ل دەڤ وان هەیە، لێ ئەڤ نمونە تشتەك تومارکری بو، لەورا مەکر گروڤە..(ج.م)..
ئاڤر:-
ل رۆژا ١٩٩٩/٦/٢٣، بۆ سمینار ل نێکەتیا نڤیسەرێت کورد-تایێ دهوکێ..

# چاو خشاندنێکی خێرای جیهانگەرایی

□ وەرگێڕانی: مەحموود ئیبراهیم پێمالکی

(الامرکە) واتە کردن بەئەمریکی یاخود سەپاندنی دەسەلاتی سەرمایەداری رۆژئاوایی لەسەرووی هەمووانەوە ئەمریکا بەسەر کاروباری جیهان لەو بوارانەی خوارەوەدا:

ئابووری: لەرێگای ئەو کۆمپانیا گەورانەی تێپەرکەرە فرە رەگەزانەوەو ئەو یاسایانەی بەسەر دەولەتان دەسەپێنن، ئەو کۆمپانیایانە دەزگەی ئابووری دەرکەوتوون کە دەسەلاتی راستەقینەی خۆیان بەسەر ئابووریدا دەسەپێنن و حکومەتانیش بەهۆی یارمەتی ئەو کۆمپانیایانەوە دەچنە ناو ئابووری جیهانیەوەو دەسەلاتی خۆیان بەسەر ئەو ئابووریەدا دەسەپێنن. بۆ جێگیر کردنی بایەخەکانی(القیم) کەلە تۆڕی ئەمریکی ئەمریکادا دەسەلاتی خۆی دەسەپێنێ بەسەر بازاڕی جیهانیدا لە رێگەی دروستکردنی فیلمی سینەماییەوە کە لەو بوارەدا بالا ددستە، (بنیامین بارین) سەرنجی لیستێکی داوە بۆ گرنگترین ئەو فیلمانەی سالی ١٩٩١ پیشاندراون و ٢٢ دەولەتی جیهانی کۆنترۆلیان کردووە لە بەرازیلەوە بۆ پۆلەنداو مالیزیاو روونی کردۆتەوە کە ئەوانە فیلمی ئەمریکی بەناوبانگن و لەکاتێکدا دەرکردنی فیلمی سینەمایی خۆ ولاتی ئەو دەولەتانە تووشی تەنگژەیەکی خراپ بوون، هەروەها کۆمپانیاکانی راگەیاندنی ئەمریکی دەسەلاتی خۆیان سەپاندۆتە سەر هۆیەکانی راگەیاندن و زانیاریو وێنەو فیلم و کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت لە رێگەی مانگە دەستکردەکانەوە لە بۆشایی ئاسماندا. بۆ سەپاندنی بایەخەکانی سیاسیو کۆمەلایەتی ئەمریکی باسی ئەوە دێنێتە کایەوە کە چۆن گەلان لە کۆت و پێوەندی دەولەتی نەتەوایەتی دەرباز بن و سەیری ئاسۆی جیهانی بکەن کە مانای مافی مرۆڤی تێدایە(بە گوێرەی ئەمریکیەکان لێی تێدەگەن) هەروەها دیموکراتیەتی بازاڕ(وەك خۆیان دەیزانن) دژایەتی بایەخەکانی نیشتمانیو رەگەزایەتیو تیرۆر(وەك خۆیان دیاریان کردووە). بە کورتی گۆڕینی جیهان بۆ کۆمەلگەیەکی جیهانی کە بایەخەکان و بیرۆکەی یەککگرتووی هەبێ لەسەر حیسابی ناسنامەی نیشتمانیو کەلتووری جۆراوجۆرو شارستانیەتی هەمە چەشنەی گەلان، ئەو شتانە بەنەرم و نیانی و هەلسوکەوتی باش تەواو دەبن لەگەل ئەوانەی خۆیان بەدەستەوە دەدەن، بەلام ئەوانەی

یاخی بین بە تۆبزیو سەپاندنی هێز. (لە راستیدا ئێستاکە جیهانگەرایی خاوەن دەسەڵات، گەلان لە کەلتووری دیاریکراو دوور دەخاتەوەو لەگەڵ ئەوەشدا شێوازی بیرکردنەوەیو رەوشت و بایەخەکان شێوازێکی داخراون(الانغلاق)و تێکڕایی(الشمولی)و لێنەبوردن و(رەتکردنەوەی تێکەڵ بوون) لەگەڵ نەریت و شێوازی ژیان و بایەخەکانی ئەمەریکی دا هەیە، ئەمەریکاش ئێستاکە داب و شێوازی دەداتیو دەیخاتە ناو جیهانگەراییەوە لە چوارچێوەی دا خواستی گردبوونەوە بۆ ناوەند لە خواستی ئەورپییەوە(Europe-centrism) بۆ خواستی ئەمەریکی گوێزرایەوە، خواستی ئەمریکیش لە راستیدا تەنها بریتیە لە هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی مانای ئاشتی ئەمریکی ئەو حەزەش لە سیاسەتی کەلتووری ئەمریکاوە هەڵقوڵاوە لەو کاتەوە کە ئەمریکا هاتۆتە کایەوە. جیهانگەرایی هەوڵی داوەو هەوڵیش دەدا بۆ گواستنەوەی دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەتانە بۆ ژێر دەستی ئەو دەزگە داراییو بازرگانیە جیهانیانەی کە هیچ رەگەزیان نییە هەروەکو(ئیجا نسیو رامۆنیت) روونی کردۆتەوە: جیهانگەرایی دەوڵەتی تایبەتی خۆی بنیات ناوە کە بریتیە لە دەوڵەتێك لەسەرووی نیشتمانەکانەوەو خاوەنی ئامێری تۆڕو هۆیەکانی تایبەتی خۆیەتی، تۆڕی جیهانگەراییش پێکهاتووە لە سندوقی دراوی نێودەوڵەتی(سندوق النقد الدولی)و بانقی دەوڵەتی دەزگەی پەرەپێدان و داکۆکی ئابووری(منظمە التنمیە والتعاون االقتصادی)و دەزگەی بازرگانی جیهانی.(ریچارد کاردن) راوێژکاری کاروباری دەرەوەی ئەمەریکا دەڵێ (لەراستیدا دەست بەسەرداگرتنی سەروەری دەوڵەتان پارچەپارچە خێراتر دەمانگەیەنێتە سیستەمی جیهانی لەوەی کە بەشێوەیەکی کلاسیکی هێرش بکەین). پرۆژەی سیتەمی دەوڵەتی تازە لەسەر بنچینەی لێکهەڵوەشاندنی سیاسی(واتا ئەو دەوڵەتانی کە بە کردەیی هەن)و کردنیان بە دەوڵەتانی بچوکبچوکی لاوازو گیرۆدەبوون بەکارەساتی گرانیو ململانێ و تەنگژەو لە رێگەی پارچەپارچەکردن و دابەشکردنەوە چونکە ئەمریکا لە رێگەی چارەسەرکردن و دەستێوەردانیەوە هەوڵدەدات بۆ دابەشکردنی وڵاتێك کە بیکاتە دوو وڵاتی سەربەخۆ یا زیاتر ئەگەر بتوانێ هەروەکو لەسودان و ئەفغانستان و بۆسنە روویدا ئەمڕۆش لە یوگسلافیادا روودەداو لە شوێنیتریش لە پێناوی ئەوەدا کە بارودۆخی نیشتمانیو نەتەوایەتی نالەبار بکەن، هەروەها بارودۆخی جوگرافیش پەك بخەن تاکو بیکاتە چەند بنچینەیەکی تەبا بۆ بە پیرەوە چوونی جیهانگەرایی ئەمەریکیو قەبوڵکردنی وەکو چارەنووسێك کە هیچ رەتکردنەوەی نییەو بێئەوە هیچ ناکرێو وا دابنرێ وەکو شەمەندەفەرێکی خێرایە بەرەو سەدەی داهاتوو دەڕوا، هەرکەسێك سواری ئەو شەمەندەفەرە نەبێ ئاکامی دوورە پەرێزیو تێکشکانەو، پرۆژەی ئەمەریکی خەریکە بە پشت شکاندنی کوتلەی ئۆراسی(الکتلە الاوراسیە) (واتە جیهانی ئەورووپیو ئاسیەوی یاخود جیهانی سۆسیالیستی دووەم) دەستپێدەکاو دانانی ئەو پرۆژەیە بە نموونە زۆرەکانیەوە لەژێر رەحمەتی تەنگژەکانی ئابووریو سیاسیو رەگەز پەرستیو ئایینی

ئەگەر بگونجێ) لەکاتێکدا ئەو هەموو شتانە لەخۆڕا کاریان نەکردۆتە سەر بنەڕەتی سیستەمە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکان لە ئەمەریکاو ئەوروپای رۆژئاوا، واتە دەزگەی سەرمایەداریو دەزگەکانی جیۆپۆلۆتیکی کە بەردەوام لەمەودای خۆیدا دەسووڕێتەوە لە راستیدا ئەو شتەی جیهان بەرەو سەدەی ئاییندە دەبات بریتیە لەوپەڕی سوود وەرگرتن لە دەرفەتەکانی گۆڕانکاریو رووداوی کاریگەر لە ئۆراسیاداو بەتێکڕایی لەبەرژەوەندی هێزی جەنگی رۆژئاوایە(واتە بە بڵاوکردنەوەی خێرا لە زەویو دەریادا) لە رووی سیاسیەوە(سەروەری کردنی یەك تاکە بەڕێوەبەرایەتی) لە رووی ئابووریەوە(دابینکردنی پێداویستی نەوت بەتایبەتیو لە رێگەی کەلتووریشەوە پەیوەستیو زانستی)...هتد، لە راستیدا ئەو شتانە پاڵی بە(پنتاگۆنەوە) ناوە بۆ بنیاتنانی تیۆری کێشەکانی توندی نزم(Lowre intensitw) کە ستراتیژیەتی ئەمەریکا بایەخێکی زۆر تایبەتی پێدەداو مانای تیۆرەکەش ئەوەیە: کە ئەمەریکا درێژە بە رەوشی ئێستاکە بداو بپرۆخێنێ لەپێناو لاوازکردنی جیهانی سێیەم بەتایبەتی ئاسیاو ئەفریقیا) لە رێگەی گەشە پێدانی کێشەی بەرەکانی شەڕو کێشەکانی ناوەوەو کەمایەتیە سیاسیەکان و کێشەی رەگەزی، پەرەپێدانی ئەو کێشانە لە رووی سیاسیەوەو بڵاوکردنەوەیان لەناو کۆمەڵدا تاکو بارودۆخەکە خراپتر بێت بۆ درێژترین ماوە بەڵکو بارودۆخەکە وای لێبێت تەنگژەو کۆسپ دروست بێ شەڕ نانەوەی تێدا پەیدا ببێ هەروەها درێژەدان بە شەڕوشۆڕو لێکهەڵوەشاندنی تایەفی بیروباوەڕو زۆر بوونی پێچەوانە لە هەڵوێستدا لەناو ئەو وڵاتە ئیسلامیانەی پەیوەندیان بە رۆژئاواوە هەیە یا ئەوانەی پەیوەندیان نیە یاخود دان پیّدانانی سیاسی خێرای رۆژئاوا بە دەزگەی سیاسی دژ بە رۆژئاوا یاخود هەڵگیرسانی ململانێ لەو هەرێمانەی یەك حکومەتیان هەیە. تەنها تێڕوانینێکی قوڵ لە نەخشەی کۆسپی توند کە جیهان بەتێکڕایی تێیدا دەژی بۆمان دەردەکەوێ کە کیشوەری ئاسیا بەتەواوبوونی سەدەی بیستەم پلەی یەکەم گەورە بەخۆوە دەبینێ دەربارەی بەرپابوونی کۆسپ و تەنگژەو کێشەی توندی خراپەکاری، کە(بۆماوەی ٣٠ساڵ) بەردەوام دەبێ بۆ لێکهەڵوەشاندنی بنەڕەتی نەتەوایەتیو یەکگرتنی نیشتمانی جوگرافیو سیاسیو ئابووری بەرهەمهێنەر، کێشەی توندی بچکۆڵە بەشی ئەوە دەکا کە بێ ئارامی بنێتەوە لە هەمان کاتدا کۆسپی بێزارکەر دەنێتەوە بەڵام ئەو کۆسپانە هەڕەشە نین. دەسەڵاتی کۆمپانیا زەبەلاحەکان: ئەو کۆمپانیا زەبەلاحانە بەسەر (٩) دەوڵەتدا دابەش دەبن ئەوانەش:

ژاپۆن(٦٢)، ئەمەریکا(٥٣)، ئەڵمانیا(٢٣) فەرەنسا(١٩)، بەریتانیا(١١)، ئیتالیا(٥)، کۆریای خوارو(٤)، هۆڵندا(٤)، ٢٠٠ کۆمپانیا لەو کۆمپانیایانە ٣٠٪ بەروبوومی جیهانیان دەستکەوتووە تا ساڵی ١٩٩٥ لە چوارچێوەی پاوانکردن و دەرخستنی خواستی تاك کە جیهانگەرایی دەیچەسپێنێ راپۆرتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەڵێ: سامانی ٣٥٨ کەسی هەرە دەوڵەمەندانی جیهان یەکسانە بە سامانی ٢٠٢ ملیۆن کەسی

هەژارەكانی جیهان. بەمانایەكی‌تر ٢٠٪ی هەرە دەوڵەمەندەكانی جیهان ٨٠٪ی بەرهەمی خۆماڵیی خاوی(الانتاج المحلی الخام) هەموو جیهان لەنێوان خۆیاندا بەش دەكەن. یەكەم ناو بۆ ئەم كۆمپانیایانە دانراوە بەناوی كۆمپانیای رەتبووی رەگەزەكان(Transnational) نەك فرە رەگەز(multinational) ئەو زاراوە مانای وایە كۆمپانیای زۆر لە حكومەتەكان لە سەرمایەدا هاوبەشی دەكەن بەڵام ئەو كۆمپانیایانەی كە ئێمە باسی دەكەین لە رەگەزو سنووری نەتەوایەتی‌و دەوڵەتە سەربەخۆیەكان تێپەڕدەكەن، قەبارەی ئەو كۆمپانیایانە لەگەڵ چەندین سەرمایەدا یا بەژمارەی مووچەی كرێكاران بەراورد ناكرێ چونكە ئەو كۆمپانیایانە لەكەشێكی شۆڕشی تەكنەلۆژی هاتوونەتە كایەوە بەرهەمەكانیان بۆ ئاستێك بەرزكردۆتەوە كە لەپێشوودا بەو شێوەیە نەبوو هەروەها قەبارەی شت و مەك و بەرهەمهێنان زۆر باش نابێ چونكە ئەو شتومەكانەی بەرهەم دێن یەكجار هەمە چەشنەن بەڵام گرنگترین پێوانە ژمارەی فرۆشراوەكانە(واتە هەرچەندێك فرۆشیار زۆر بێت چاترە) بە واتایەكی‌تر مانای جیهانگەرایی ئابووری كە لەسەر كۆمپانیاكانی سەرمایەداری زەبەلاح دامەزراون كە نەتەوەكان تێپەڕ دەكەن لەگەڵ مانای ئابووری‌نێودەوڵەتی جیاوازیان هەیە چونكە ئابووری نێودەوڵەتی هەروەكو روون بۆتەوە جەخت دەكاتە سەر پەیوەندی ئابووری ناو ئەو دەوڵەتانەی سەربەخۆییان هەیە بەڵام لەژێر سێبەری جیهانگەراییدا كۆمپانیاكانی سەرمایەداری سەرووی نەتەوایەتی( فوق القومیە) شتێكی تایبەتی بنەڕەتی پێكدێنێ، ئەو كۆمپانیایانە زەبەلاحن كە نرخی فرۆشتەنیساڵێك بۆ یەكێك لەو كۆمپانیایانە لە بەرهەمی خۆماڵی چەن دەوڵەتێكی مامناوەندیا تێپەڕ دەكاو توانای ئەوەیان هەیە سەروەری دەوڵەت راگرن، دەتوانن لقەكانی لە دەوڵەتێكەوە بۆ دەوڵەتێكی‌تر بگوازێتەوە بە رادەیەك كار دەكاتە سەر دەوڵەت و دەبێتە بەربەستێك بۆ ئەو دەوڵەتەی تیایەتی‌و ئەو كۆمپانیا سەروو نەتەوەییانە وەكو بانقە گەورەكان و كۆمپانیاكانی دابینكردن و گەنجینەكانی دەوڵەت(بیوتات المال) ئەوانە دەوری پۆلیس دەبینین چونكە ئەو دەوڵەتەی لەناوی دایە پابەندی دەكا بۆ بەرهەمهێنان و بەكارهێنانی ئەو سەرمایانە لە دەوڵەتانی‌تر كە ئەوەش دەبێتە هۆی دابەزینی نرخی دراوەكان و پشكەكان(الاسهم) و پسووله لەو دەوڵەتەی ئەو كۆمپانیایانەی تێدان و روودانی بێ‌پارەبوونی زۆر، ئەو دەوڵەتە پیشەسازیە نوێیانەی ئاسیا بۆ ئەوە باشترین نموونەن وەك مالیزیا، كۆریای خوارو، تایلەند، تایوان، كە سندوقی دراوی نێودەوڵەتی تێدان و دەوری پۆلیس دەبینن.

فەیلەسووفی ئابووری ئەڵمانی(وولف جانج ساجس) دەڵێ: خراپترین شت كە بێتەدی ئەوەیە كە هەوڵ و تەقەلای جیهانگەرایی سەركەوێ، چونكە سوودمەند لەوەدا كە مایە سیەكی بچووكە كە بریتین لە كۆمەڵێك ماستاو كەر دەوریان داوە كە پەیوەندی ئابووریان لەگەڵ ئەو كەمایە سیەدا هەیە بەڵام جگە لەوانە خەڵكی‌تر تەنها دەبێ شەڕ بكەن لەگەڵ یەكتردا و یەكتری بكوژن. جیهانگەرایی یانەیەكی تەبا نییە بۆ هەمووان كە دەوڵەمەند

بچێتە ناوی بۆ شوێن کەوتنی دەرفەتی بەهێزبوون، هەژار بچێتە ناوی تاکو بەشوێن دەرفەتی دەوڵەمەندبووندا بگەڕێ. بەڵام یانەیەکە دەوڵەمەندو هێزدارەکان دەچنە ناوی‌و کەسی تر ناچێتە ناوی، جارێکی‌تریش دەڵێم دەوڵەتانی جیهانی سێیەم لەبەردەم دیاردەیەکی نوێدان کە چەند کۆمپانیایەکی تێپەڕکەری فرە رەگەز و ردە وردە دێنە ناو دەوڵەتی نەتەوایەتی‌و بەهەمان ئەو رێبازەی کە دەوڵەتی نەتەوایەتی هاتۆتە شوێنی دەوڵەتی دەرەبەگی بەر لە (٥)سەدەو ئەو کۆمپانیا زەبەلاحە تێپەڕکەرە فرە رەگەزانە یاخود رەتبووی کیشوەرەکان هەوڵ دەدەن کە سۆزی بەرینی ئەو دەوڵەتە هەژارانە لەناو بەرن، ئەو سۆزانەش وەکو سۆزی بیرو باوەڕو نیشتمان و نەتەوەو ئەو سۆزانە بۆ چەند سۆزێکی نوێ بگۆڕن وەکو رۆژهەلاتی ناوەڕاستی(الشرق اوسگیه)، ئەفریقی ئاسیەوی هی‌تریش لەو ناوبردنانە کە ئەو ناوانە تایبەتمەندیان کەمە لەگەڵ دەوڵەتی عەرەبی‌و ئیسلامی لەنێوان یەکتردا ئەو مەرامەش بە پەیوەندی دەزگەکانی ئابووری دەوڵەتان پێکدێ وەکو بانقی دەوڵەتی، سندوقی دراوی دەوڵەتی، دەزگەکانی هەواڵگری هەمەچەشنەی دەوڵەتە گەورەکان و دەستەکانی پاداشتی نێودەوڵەتی. لەراستیدا جیهان لە روانگەی ئەو دەزگەیانەوە یارییەکی گەورەیە لە یارییەکانی کۆمپیوتەر کە لای ئەوان دراویان بە فیڕۆ ناڕوات لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا بەڵکو ماڵەکەیان دوو چەندانە زۆر دەبێو بەهۆی پێشبڕکێوە لە بازاڕی دراوو بەشەکان و دەسکەوتنی قازانجی زۆر بەهۆی گۆڕانکاری بەش و دراوەکان لەماوەی زۆر کورتدا کە بریتین لە چەند خولەکێك و پسپۆڕەکان وای دەخەملێنن کە بەرامبەر هەر یەك دۆلار لە بواری بەرهەمهێنانی راستەقینەدا دەبێ بە ٢٠ دۆلارو دەستاو دەستی پێدەکرێ لە بازاڕی بەشەکاندا. لەبەر ئەوە تێڕوانینی ئەو کۆمپانیایانە رەتبووی رەگەزەکانە کە ماڵیان لە دەوڵەتەکانی جیهانی سێیەمدا بەرهەم دێنن ئەوە تێڕوانینێکی هەڵەیە، چونکە ئەو کۆمپانیایانەی لەو دەوڵەتانەی کاریان تێدا دەکەن ماڵ دەمژن نەك بەرهەم دێنن، دەبێ بزانین تەنها میسر ١٠٠ ملیۆن دۆلار لەو کۆمپانیایانەدا بەرهەم دێنێ. نووسەر (ولیەم جراید) لە کتێبەکەیدا بەناو نیشانی کێ بەگەڵ رادەگەیەنێ (Who will tell the people) دەڵێ لەراستیدا سەرچاوە مەزنەکانی دراوی کۆمپانیاکان و زۆربوونی بەرژەوەندییەکانیان و ئەو شارەزایانەی کاریان تێدادەکەن بریتین لە گەنجینەی گەورە کە ئێستاکە بەهەموو تواناکانیانەوە کاردەکەنە سەر دەسەلاتەکانی بەڕێوەبردنی دەوڵەت کە بە گوێرەی ئەو بارودۆخە کاربکەن خزمەتی پرۆگرامە ئاشکراو نهێنییەکانیان بکەن، لە راستیدا رەوشی ئەو دەزگە نوێیانە خولگەیەکن کە بیرو باوەڕی دیموکراتی نوێ‌و باو تێکدەشکێنن، ئەو کۆمپانیایانە بۆ هاتوونەتە کایەوە تاکو قازانجەکانی خۆیان زۆر بکەن نەك خزمەتی ئاواتەکانی کۆمەڵگە بکەن، سەرۆك و خاوەنەکانی ئەو کۆمپانیایانە کۆمپانیاکان بەڕێوە دەبەن بەڵام ئاواتی کۆمەڵگە بەڕێوە نابەن. دیارە دەرفەت پەیداکردن بۆ ئەو کۆمپانیایانە دەبێتە هۆی ئەوەی دەست بەسەر

